# ٥٠ چیرۆکی صحیح

## له فەرموودەکانی بوخاری دا






ئامادەکردنی
علي عبدالعال الطهطاوی

وەرگێرانی
عبدو الرحمان ئەحمەد

# ٥٠ چیرۆکی

# صەحیح

## لە فەرمودەکانی بوخاری دا

نوسینی  : علی عبدالعال الطهطاوي
وەرگێڕانی: عبدالرحمن ئەحمەد

بسم الله الرحمن الرحيم


ناوی کتێب : 50 چیرۆك لە فەرمودەکانی بوخاری دا

نوسینی : علی عبدالعال الطهطاوي

وەرگێڕانی : عبدالرحمن ئەحمەد

ژمارەی سپاردن : (١٦١٣) ساڵی ٢٠٠٩ ی وەزارەتی ڕۆشبیری پێدراوە

نۆرەی چاپ : یەکەم

# پێشەكی

إن الحمد لله ، نحمده ، و نستعينه ، و نستغفره ، و نعوذ بالله من شرور أنفسنا ، ومن سيئات أعمالنا ، من يهده الله فلا مضل له ، و من يضلل فلا هادي له ، و أشهد أن لاإله إلا الله وحده لاشريك له ، و أشهد أن محمداً عبده ورسوله.

پاشان

شاراوه نی یه لای كه‌سێك كه كه‌مترین په‌یوه‌ندیی و ئاگاداریی هه‌بێت له زانست و ئایین و فه‌رمایشته‌كانی پێغه‌مبه‌ری ئه‌مین (ﷺ) كه كتێبی (صحيح الإمام البخاري) ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت چ پله و پایه‌یه‌كی هه‌یه ، كه زانایان به ڕاسترین كتێبی ده‌زانن له دوای قورئانی پیرۆز ، دیاره ئه‌وه‌ش كتێبێكه شایسته‌ی ئه‌و پله‌و پایه‌یه‌یه .

هه‌روه‌ك دانه‌ره‌كه‌ی واته پێشه‌وا (أبو عبدالله البخاري) ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت خوا فه‌زڵی به‌سه‌ردا ڕشتو به‌هۆی زانست و تێگه‌یشتن و له‌به‌ركردن و دڵسۆزیی یه‌وه ئه‌و پله‌و پایه به‌رزه‌ی له‌ناو زانایاندا پێ به‌خشی كه بریتی یه له‌وه‌ی كتێبه‌كه‌ی ڕاسترین كتێب بێت دوای قورئانی پیرۆز كه خوای گه‌وره خۆی كه‌فیله به پاراستنی .

ئیمامی بوخاری ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت له هه‌ڵبژاردنی فه‌رمووده (صحيح)ه‌كانیدا كۆمه‌ڵێك مه‌رجی دانا كه له چڵه پۆپه‌ی (إتقان) و دڵسۆزی ده‌ست پاكی و ئیحتیات كردنی گه‌وره دا بوو له پێناوی فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌ری خوادا (ﷺ) كه بریتی یه له نواندنی سونه‌ته‌كانی ، كه هاوتای قورئانه ، و ماناكانی ڕاڤه ده‌كا و ئه‌وه‌ی به كورتی باسی كردووه ئه‌م ڕوونی ده‌كاته‌وه، ئه‌وه‌ی به ڕه‌هایی باسی كردووه ئه‌م سنوری بۆ داده‌نێ ، واته بریتی‌یه له ژیانی پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمایشت و كرده‌وه و دان پێدانان و خوڕه‌وشت و سیفه‌ته‌كانی.

هه‌روه‌ك كتێبه‌كه‌ی ئیمامی بوخاری (به ڕه‌حمه‌ت بێت) به ڕوونیی له هه‌موو ده‌روازه‌یه‌ك له ده‌روازه‌كانی دین دا ئه‌وه‌ی ڕوون كردۆته‌وه كه موسوڵمان ده‌بێت بیرو باوه‌ڕ و په‌رستش و ووته و كردار و مامه‌ڵه‌ی چۆن بێت ، بگره هه‌موو گۆشه‌كانی ژیانی هه‌موو ئه‌وانه له میانه‌ی جێ پێ هه‌ڵگرتنی پێغه‌مبه‌ری خوادا (ﷺ)كه له لایه‌ن خواوه ڕایده‌گه‌یه‌نێت.

جا له‌به‌رئه‌وه‌ی بابه‌ته‌كه‌ی ئێمه بریتی‌یه له باس كردنی هه‌ندێ له‌و چیرۆكانه‌ی ده‌بنه په‌ند و ئامۆژگاری و سود بۆ هه‌موو موسوڵمانێك ، وه بینیومانه ئه‌و كه‌سه‌ی ئه‌م ڕێگه‌یه‌ی گرتوه‌ته به‌ر

(ڕێگەی چیرۆك) بە جوانیی شەن و كەوی نەكردووە ، بگرە بە كتێبەكەیدا ڕاست و لاواز و هەڵبەستراوی ئاوێتە كردووە ، لە نێوان ئەوەی هاوتەریبە لەگەڵ بیرو باوەڕی ئیسلام داو ئەوەی بانگەشەیە بۆ هاوبەش پەیداكردن و بێ باوەڕی . لەوەدا هیچی لەبەرچاو نەگرتووە جگە لە سەرنج ڕاكێشان بۆ قسەی بەتاڵ ، كە خراپەكەی زۆرترە لە چاكەكەی ، زیانی زۆرترە لە سودی ، ئەگەر ئەسڵەن سودی تیا بێت.

ئاشكرایە باسی چیرۆك ئەچێتە بواری ڕاست و درۆوە ، چونكە بابەتی هەواڵە جا ئەگەر چیرۆكەكە ڕاست بێت ئەوا هەواڵەكە ڕاستە و ئومێدی لێ دەكرێت سودی هەبێت ، ئەگەر چیرۆكەكەش لاواز یان دروست كراو و هەڵبەستراو بێت ، ئەوا هیچ خێرێكی تیا نیە هەرچەند نوسەرەكەی پێ ی وابێت.

لەبەر ئەوە پێمان باش بوو موسوڵمانان ئاڕاستە بكەین بۆ جێگایەك كە مەزنترین شوێنە كە تیایدا بە شوێن چیرۆك دا بگەڕێین و پەندی لێ وەربگرین، ئەوەش بریتی یە لە سوننەتی پێغەمبەری نازدار (ﷺ) و هاوەڵە بەڕێز و پیرۆزەكانی ، وە لە گەورەترین و ڕاسترین كتێب لە دوای پەڕاوی خوای گەورە ئەویش بریتیە لە (صحيح الإمام البخاري) رحمه الله ئەمەش (٥٠ چیرۆكە لە چیرۆكەكانی (صحيح البخاري) ) خۆیشمان ناڕەحەت نەكردووە بەوەی ڕاڤەیەكی دوور و درێژی چیرۆكەكە بكەین ، بەڵكو چەند ئاماژەیەكی كەمە بۆ هەندێ شوێن كە پێویستی بە ڕوون كرنەوە هەیە ، ئەگینا لە سایەی خواوە مەسەلەكە پێویستی بە ڕوون كردنەوەی زۆر نیە .

جا (خوێنەری خۆشەویست) ئەو چیرۆكانە بخوێنەوە و پەندی لێ وەربگرە و بۆ ماڵ و منداڵەكانت و خوشك و براكانتی باس بكە و خوڕەوشتی بەرز و پەسەند و بیرو باوەڕی هاوەڵە بەڕێزەكانی لێ وەربگرن.

لە خوای گەورە داوا كارین بەسوودی بكات و بیكاتە كردەوەیەكی چاك كە ئەو بە تواناییەو سەرپەرشتیاری خۆمان و كردەوەكانمانە.

وصلى الله و سلم و بارك على نبينا محمد ، وعلى اله و صحبه أجمعين

و الحمد لله رب العالمين.

## چیرۆكی یه‌كه‌م

## چیرۆكی هاتنی وه‌حیی بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا

عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ، أَنَّهَا قَالَتْ : أَوَّلُ مَا بُدِئَ بِهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنَ الْوَحْيِ الرُّؤْيَا الصَّالِحَةُ فِي النَّوْمِ، فَكَانَ لاَ يَرَى رُؤْيَا إِلاَّ جَاءَتْ مِثْلَ فَلَقِ الصُّبْحِ، ثُمَّ حُبِّبَ إِلَيْهِ الْخَلاَءُ، وَكَانَ يَخْلُو بِغَارِ حِرَاءٍ فَيَتَحَنَّثُ فِيهِ وَهُوَ التَّعَبُّدُ اللَّيَالِيَ ذَوَاتِ الْعَدَدِ قَبْلَ أَنْ يَنْزِعَ إِلَى أَهْلِهِ، وَيَتَزَوَّدُ لِذَلِكَ، ثُمَّ يَرْجِعُ إِلَى خَدِيجَةَ، فَيَتَزَوَّدُ لِمِثْلِهَا، حَتَّى جَاءَهُ الْحَقُّ وَهُوَ فِي غَارِ حِرَاءٍ، فَجَاءَهُ الْمَلَكُ فَقَالَ اقْرَأْ. قَالَ ( مَا أَنَا بِقَارِئٍ ). قَالَ ( فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي ) فَقَالَ اقْرَأْ. قُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّانِيَةَ حَتَّى بَلَغَ مِنِّي الْجَهْدَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ اقْرَأْ. فَقُلْتُ مَا أَنَا بِقَارِئٍ. فَأَخَذَنِي فَغَطَّنِي الثَّالِثَةَ، ثُمَّ أَرْسَلَنِي فَقَالَ ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ * خَلَقَ الإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ * اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ﴾ . فَرَجَعَ بِهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَرْجُفُ فُؤَادُهُ، فَدَخَلَ عَلَى خَدِيجَةَ بِنْتِ خُوَيْلِدٍ رضى الله عنها فَقَالَ ( زَمِّلُونِي زَمِّلُونِي ). فَزَمَّلُوهُ حَتَّى ذَهَبَ عَنْهُ الرَّوْعُ، فَقَالَ لِخَدِيجَةَ وَأَخْبَرَهَا الْخَبَرَ ( لَقَدْ خَشِيتُ عَلَى نَفْسِي ). فَقَالَتْ خَدِيجَةُ كَلاَّ وَاللَّهِ مَا يُخْزِيكَ اللَّهُ أَبَدًا، إِنَّكَ لَتَصِلُ الرَّحِمَ، وَتَحْمِلُ الْكَلَّ، وَتَكْسِبُ الْمَعْدُومَ، وَتَقْرِي الضَّيْفَ، وَتُعِينُ عَلَى نَوَائِبِ الْحَقِّ. فَانْطَلَقَتْ بِهِ خَدِيجَةُ حَتَّى أَتَتْ بِهِ وَرَقَةَ بْنَ نَوْفَلِ بْنِ أَسَدِ بْنِ عَبْدِ الْعُزَّى ابْنَ عَمِّ خَدِيجَةَ ـ وَكَانَ امْرَأً تَنَصَّرَ فِي الْجَاهِلِيَّةِ، وَكَانَ يَكْتُبُ الْكِتَابَ الْعِبْرَانِيَّ، فَيَكْتُبُ مِنَ الإِنْجِيلِ بِالْعِبْرَانِيَّةِ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَكْتُبَ، وَكَانَ شَيْخًا كَبِيرًا قَدْ عَمِيَ ـ فَقَالَتْ لَهُ خَدِيجَةُ يَا ابْنَ عَمِّ اسْمَعْ مِنَ ابْنِ أَخِيكَ. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ يَا ابْنَ أَخِي مَاذَا تَرَى فَأَخْبَرَهُ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ خَبَرَ مَا رَأَى. فَقَالَ لَهُ وَرَقَةُ هَذَا النَّامُوسُ الَّذِي نَزَّلَ اللَّهُ عَلَى مُوسَى يَا لَيْتَنِي فِيهَا جَذَعًا، لَيْتَنِي أَكُونُ حَيًّا إِذْ يُخْرِجُكَ قَوْمُكَ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ( أَوَمُخْرِجِيَّ هُمْ ). قَالَ نَعَمْ، لَمْ يَأْتِ رَجُلٌ قَطُّ بِمِثْلِ مَا جِئْتَ بِهِ إِلاَّ عُودِيَ، وَإِنْ يُدْرِكْنِي يَوْمُكَ أَنْصُرْكَ نَصْرًا مُؤَزَّرًا. ثُمَّ لَمْ يَنْشَبْ وَرَقَةُ أَنْ تُوُفِّيَ وَفَتَرَ الْوَحْىُ. ( البخاري/ ٣ )

له عائیشه‌ی دایكی ئیماندارانه‌وه (خوای لێ ڕازی بێت ) فه‌رموویه‌تی: سه‌ره‌تای هاتنی وه‌حی بۆ پێغه‌مبه‌ری خوا خه‌ونی ڕاست بوو ، هه‌ر خه‌ونێكی بدیایه وه‌كو ڕووناكیی به‌ره‌به‌یان ده‌هاته دی

، پاشان گۆشه‌گیریی له لا خۆشه‌ویست كرا ، له ئه‌شكه‌وتی (حیرا) خه‌ڵوه‌تی ده‌كێشا و تێیدا چه‌نده‌ها شه‌و په‌رستشی ده‌كرد ، پاشان ده‌گه‌ڕایه‌وه بۆ ناو ماڵ و منداڵی و خۆی ئاماده ده‌كرده‌وه و تێشووی ده‌برد ، پاشان ده‌گه‌ڕایه‌وه بۆ لای خه‌دیجه و به‌هامان شێوه تێشووی ده‌برده‌وه له‌گه‌ڵ خۆی ، هه‌تا ئه‌وه‌بوو هه‌ق و ڕاستیی بۆ هات له‌و كاته‌دا له ئه‌شكه‌وتی حیرا دا بوو ، كه فریشته هاته لای و پێ ی ووت (بخوێنه) : فه‌رمووی: (من خوێنده‌وار نیم) ، فه‌ر مووی گرتمی و گوشیمی به‌خۆیدا هه‌تا ماندووی كردم ، ئینجا به‌ری دام و فه‌رمووی : (بخوێنه) : منیش ووتم (من خوێنده‌وار نیم) بۆ سێ جار گرتمی و گوشیمی به خۆیه‌وه هه‌تا ماندووی كردم ، ئینجا به‌ری دام و فه‌رمووی (اقرأ باسم ربك الذي خلق ، خلق الإنسان من علق ، إقرأ و ربك الأكرم) .

به‌و جۆره پێغه‌مبه‌ر گه‌ڕایه‌وه بۆ ماڵه‌وه دڵ و ده‌رووني هاتبوونه له‌رزین ، هه‌تا چووه ژووره‌وه بۆ لای خه‌دیجه و فه‌رمووی (دام پۆشن ، دام پۆشن) ئه‌وانیش دایان پۆشی هه‌تا ترس و بیمی نه‌ما ، ئینجا به خه‌دیجه‌ی فه‌رموو : (زۆر له خۆم ترسام ) خه‌دیجه ووتی : نه‌خێر ، سوێند به‌خوا ، هه‌رگیز خوا تۆ سه‌ر شۆڕ ناكات ، بێگومان تۆ په‌یوه‌ندی خزمایه‌تی به‌جێ دێنیت ، كار ئاسانی بۆخه‌ڵكیی ده‌كه‌یت ، پێداویستیی نه‌دار دابین ده‌كه‌یت ، ڕێز له میوان ده‌گریت ، كۆمه‌كیی لێ قه‌وماوان ده‌كه‌یت ، پاشان خه‌دیجه هه‌ستاو پێغه‌مبه‌ری (ﷺ) له‌گه‌ڵ خۆیدا برد بۆ لای وه‌ره‌قه‌ی كوڕی نه‌وفه‌ل كوڕی ئه‌سه‌د كوڕی عه‌بدول عوززا كه كوڕی مامی خه‌دیجه بوو ، پیاوێك بوو له سه‌رده‌می نه‌فامیدا بوو بوو به گاور ، نووسراوی به عیبرانی ده‌نووووسیه‌وه ، وه ئه‌وه‌نده‌ی ویستی خوای له‌سه‌ر بوو بێت ئینجیلی به عیبرانی نووسی‌یه‌وه ، وه‌ره‌قه پیاوێكی كوێری به ساڵاچوو بوو چاوه‌كانی كوێر بووبوون خه‌دیجه پێی فه‌رموو : ئامۆزا گوێ شل بكه بۆ برازاكه‌ت وه‌ره‌قه‌ش ووتی : ئاده‌ی كوڕی برام چی ده‌بینیت ؟ پێغه‌مبه‌ری خواش هه‌واڵی ئه‌وه‌ی پێدا كه بینیبووی ، وه‌ره‌قه ووتی : ئه‌وه ئه‌و فریشته‌یه‌یه كه خوای گه‌وره ڕه‌وانه‌ی كرد بۆ سه‌ر مووسا ، خۆزگه له‌و كاته‌دا من لاوێكی به‌هێز بوومایه ، خۆزگه زیندوو بوومایه كاتێ قه‌ومه‌كه‌ت ده‌رت ده‌كه‌ن ، پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی : (ئایا ئه‌وان ده‌رم ده‌كه‌ن؟) وه‌ره‌قه ووتی : به‌ڵێ هه‌رگیز كه‌سێك نه‌هاتووه ئه‌و په‌یامه‌ی تۆی هێنابێت و دوژمنایه‌تیی نه‌كرابێت ، ئه‌گه‌ر مام تا ئه‌و ڕۆژه پشتگیری یه‌كی به‌هێزت ده‌كه‌م ، ئه‌وه‌بوو پاش ماوه‌یه‌كی كه‌م وه‌ره‌قه مردوو و وه‌حیی دواكه‌وت .

پاشان ئیمامی بوخاری (ره‌حمه‌تی خوای لێ بێت) ده‌فه‌رموێت پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی: ( رۆژێكیان به‌رێدا ئه‌رۆیشتم كتوپڕ گوێم له‌ ده‌نگێك بوو له‌ ئاسمانه‌وه‌ ، چاوم به‌رز كرده‌وه‌ ده‌بینم ئه‌و فریشته‌یه‌یه‌ كه‌ له‌ ئه‌شكه‌وتی حیرادا هات بۆ لام ، له‌سه‌ر كورسی‌یه‌ك دانیشتبوو له‌ نێوان ئاسمان و زه‌وی دا ، منیش زۆر لێ ی ترسام یه‌كسه‌ر گه‌رامه‌وه‌ ووتم : (دام پۆشن ، دام پۆشن) خوای گه‌وره‌ ئه‌م ئایه‌تانه‌ی دابه‌زاند (یاأیها المدثر ، قم فأنذر) تا ئایه‌تی (و الرجز فاهجُر) ئه‌وه‌ بوو پاشان وه‌حی به‌ گه‌رم و گوڕی وبه‌رده‌وام داده‌به‌زی.

## چیرۆكی دووه‌م

## چیرۆكی ئیسراو میعراج (شه‌وڕه‌وی و بڵندبوونه‌وه‌)

**عنْ انس بْن مالك، قَال كَان ابُو ذر يُحدِّث انَّ رسُول اللّه ﷺ قَال " فُرج عنْ سقْف بيْتي وانا بمكَّة، فنزَل جبْرِيلُ ففرَج صدْري، ثُمَّ غسَلهُ بماء زمْزم، ثُمَّ جاء بطَسْت منْ ذهب مُمْتَلئ حكْمةً وايمانًا، فافْرغهُ في صدْري ثُمَّ اطْبقهُ، ثُمَّ اخذ بيدي .**

**فعرج بي الى السَّماء الدُّنْيا، فلمَّا جئْتُ الى السَّماء الدُّنْيا قَال جبْرِيلُ لخازن السَّماء افْتحْ. قَال منْ هذا قَال هذا جبْرِيلُ. قَال هلْ معك احدٌ قَال نعمْ معي مُحمَّدٌ . فقَال أُرْسل اليْه قَال نعمْ. فلمَّا فتح علوْنا السَّماء الدُّنْيا، فاذا رجُلٌ قاعدٌ على يمينه اسْودةٌ وعلى يساره اسْودةٌ، اذا نظر قبل يمينه ضحك، واذا نظر قبل يساره بكى، فقَال مرْحبًا بالنَّبيِّ الصَّالح والابْن الصَّالح. قُلْتُ لجبْرِيل منْ هذا قَال هذا ادمُ. وهذه الاسْودةُ عنْ يمينه وشماله نسمُ بنيه، فاهْلُ اليمين منْهُمْ اهْلُ الجنَّة، والاسْودةُ الَّتي عنْ شماله اهْلُ النَّار، فاذا نظر عنْ يمينه ضحك، واذا نظر قبل شماله بكى.**

**حتَّى عرج بي الى السَّماء الثَّانية فقَال لخازنها افْتحْ. فقَال لهُ خازنُها مثْل ما قَال: ((الاوَّلُ ففتح " . قَال انسٌ فذكر انَّهُ وجد في السَّموات ادم وادْرِيس ومُوسى وعيسى وابْراهيم ـ صلوَاتُ اللّه عليْهمْ ـ ولمْ يُثْبتْ كيْف منازلُهمْ، غيْر انَّهُ ذكر انَّهُ وجد ادم في السَّماء الدُّنْيا، وابْراهيم في السَّماء السَّادسة )).**

**قَال انسٌ فلمَّا مرَّ جبْرِيلُ بالنَّبيِّ بادْرِيس قَال ((مرْحبًا بالنَّبيِّ الصَّالح والاخ الصَّالح. فقُلْتُ منْ هذا قَال هذا ادْرِيسُ. ثُمَّ مررْتُ بمُوسى فقَال مرْحبًا بالنَّبيِّ الصَّالح والاخ الصَّالح. قُلْتُ منْ هذا قَال هذا مُوسى. ثُمَّ مررْتُ بعيسى فقَال مرْحبًا بالاخ الصَّالح والنَّبيِّ الصَّالح. قُلْتُ منْ هذا قَال**

هذا عيسى. ثمَّ مررتُ بابراهيم فقَالَ مَرحَبًا بالنَّبيِّ الصَّالِحِ والابْنِ الصَّالِحِ. قُلتُ مَنْ هذا قَالَ هذا ابراهيمُ ".

قَالَ ابْنُ شِهَابٍ فَأَخبَرَني ابْنُ حَزْمٍ أَنَّ ابْنَ عَبَّاسٍ وَأبَا حبَّةَ الأنصَارِيَّ كَانَا يَقُولانِ قَالَ النَّبِيُّ ﷺ " ثُمَّ عُرِجَ بِي حَتَّى ظَهَرْتُ لِمُستَوَى أَسمَعُ فِيهِ صَرِيفَ الأقلامِ ". قَالَ ابنُ حَزْمٍ وَأَنَسُ بْنُ مَالِك قَالَ النَّبِيُّ ﷺ " فَفَرَضَ اللهُ عَلَى أُمَّتِي خَمسِينَ صَلاةً. فَرَجَعْتُ بِذَلِكَ حَتَّى مَرَرْتُ عَلَى مُوسَى فقَالَ مَا فَرَضَ اللهُ لَكَ عَلَى أُمَّتِكَ قُلتُ فَرَضَ خَمسِينَ صَلاةً. قَالَ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لا تُطِيقُ ذَلِكَ. فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا، فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى قُلْتُ وَضَعَ شَطْرَهَا. فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لا تُطِيقُ، فَرَاجَعْتُ فَوَضَعَ شَطْرَهَا، فَرَجَعْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ ارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ، فَإِنَّ أُمَّتَكَ لا تُطِيقُ ذَلِكَ، فَرَاجَعْتُهُ. فَقَالَ: هِيَ خَمْسٌ وَهِيَ خَمْسُونَ، لا يُبَدَّلُ الْقَوْلُ لَدَيَّ. فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ رَاجِعْ رَبَّكَ. فَقُلْتُ اسْتَحْيَيْتُ مِنْ رَبِّي. ثُمَّ انْطَلَقَ بِي حَتَّى انْتَهَى بِي إِلَى سِدْرَةِ الْمُنْتَهَى، وَغَشِيَهَا أَلْوَانٌ لا أَدْرِي مَا هِيَ، ثُمَّ أُدْخِلْتُ الْجَنَّةَ، فَإِذَا فِيهَا حَبَايِلُ اللُّؤْلُؤِ، وَإِذَا تُرَابُهَا الْمِسْكُ ".(البخاري/ ٣٤٩)

لە ئەنەسی كوڕی مالیكەوە دەفەرمووێت : ئەبوو زەڕ دەی گێڕایەوە كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرموویەتی:

(لە مەككەدا بووم كەلێنێك لە سەقفی ماڵەكەم دا كرایەوە، جیبریل دابەزی و سینگی دوولەت كردم ، پاشان بە ئاوی زەم زەم شتی ، پاشان تەشتێكی ئاڵتونی هێنا ، پڕ بوو لە حیكمەت و باوەڕ ، هەمووی كردە ناو سنگمەوە ، پاشان سنگمی وەك خۆی لێ كردەوە، پاشان دەستی گرتم و بەرزی كردمەوە بۆ ئاسمانی دونیا، كاتێ گەیشتمە ئاسمانی دونیا جیبریل بە خازنی ئاسمانی فەرموو بیكەرەوە ، فەرمووی : ئەوە كێ یە ؟ فەرمووی : ئەوە جیبریلە ، فەرمووی كەسێكی ترت لەگەڵە ؟ فەرمووی : بەڵێ محمدم لەگەڵە ، فەرمووی ئایا بووە بە پێغەمبەر ؟ (وەحی بۆ هاتووە؟) فەرمووی بەڵێ .

كاتێ دەرگای ئاسمانی كردەوە و بڵند بووینەوە پیاوێكی دانیشتوومان بینی لە لای ڕاستەوە چەندین كەس و لە لای چەپیەوە چەندین كەس هەبوون ، كاتێ تەماشای لای ڕاستی خۆی دەكرد پێدەكەنی و كاتێ تەماشای لای چەپی خۆی دەكرد دەگریا ، فەرمووی پێغەمبەری چاك و ڕۆڵەی چاكم بەخێرهاتن دەكەم ، ووتم بە جیبریل ئەمە كێ یە؟ فەرمووی: ئەوە ئادەمە

(علیەالسلام) ئەو رەشاییەی لای راست و چەپی رۆحی وەچە و نەوەكانیەتی ، جا ئەوانەی لای راستی ئەهلی بەهەشتن و رەشاییەكەی لای چەپی ئەهلی ئاگرن ، جا كە تەماشای لای راستی دەكا پێدەكەنێ ، كە تەماشای لای چەپیشی دەكات دەگری . جا كە بەرز كرامەوە بۆ ئاسمانی دووەم بە خازنی فەرموو بیكەرەوە .

ئەویش هەمان قسەی (خازنی یەكەم)ی كرد ئەنەس فەرمووی : پێغەمبەر (صلی الله علیە وسلم) باسی كرد كە لە ئاسمانەكاندا ئەم پێغەمبەرانەی بینیوە ئادەم و ئیدریس و موسا و عیسا و ئیبراهیم (سڵاوی خوایان لێ بێت). بەڵام باسی نەكرد كە پلە و پایەیان چۆن بووە ، بەڵام فەرمووی ئادەم لە ئاسمانی دونیادا و ئیبراهیم لە ئاسمانی شەشەم دا بووە.

ئەنەس فەرمووی: كاتێ پێغەمبەر (ﷺ) بەلای حەزرەتی ئیدریس دا تێپەڕی فەرمووی: (پێغەمبەری ساڵح و برای چاك بەخێر بێیت) . ووتم : ئەمە كێ یە ؟ فەرمووی ئەوە ئیدریسە (علیەالسلام) پاشان بە لای موسا دا تێپەڕیم فەرمووی: (پێغەمبەری چاك و برای چاك بەخێر بێیت) . ووتم : ئەمە كێ یە ؟ فەرمووی: ئەوە موسایە (علیەالسلام) پاشان بە لای عیسا دا تێپەڕیم فەرمووی: (پێغەمبەری چاك و برای چاك بەخێر بێیت) . ووتم : ئەمە كێ یە ؟ فەرمووی: ئەوە عیسایە (علیە السلام)، پاشان بە لای ئیبراهیم دا تێپەڕیم فەرمووی: (پێغەمبەری چاك و رۆڵەی چاكم بەخێر بێیت) . ووتم : ئەمە كێ یە ؟ فەرمووی: ئەوە ئیبراهیمە (علیەالسلام).

أبن شهاب دەفەرموێ : ابن حزم هەواڵی پێدام ابن عباس و أبو حبة الأنصاری دەیان فەرموو: پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: (پاشان بەرزكرامەوە بۆ ئاستێك كە گوێم لە خشەخشی قەڵەمەكان بوو) هەروەها دەیان فەرموو : پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی : ( پاشان خوای گەورە پەنجا نوێژی لەسەر ئوممەتم فەرز كرد، منیش لەگەڵ خۆمدا هێنامەوە تا گەیشتمە لای مووسا فەرمووی : خوای گەورە چی لەسەر ئوممەتەكەت فەڕز كرد ؟ ووتم: پەنجا نوێژی فەڕزكردووە . فەرمووی بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت چونكە ئوممەتەكەت توانای ئەوەی نیە . منیش گەڕامەوە خوای گەورە نیوەی كەم كردەوە ، پاشان تێپەڕیمەوە بە لای مووسادا و ووتم نیوەی كەم كردەوە ، . فەرمووی بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت بە ڕاستی ئوممەتەكەت توانای ئەوەی نابێت . منیش گەڕامەوە بەشێكی تری لابرد ، گەڕامەوە بۆ لای فەرمووی بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت بێگومان ئوممەتەكەت توانای ئەوەی نیە منیش گەڕامەوە و فەرمووی ﴿پێنج نوێژە بەڵام

پەنجایە (واتە خێری پەنجا نوێژتان بۆ دەنوسرێت) ووتە و كەلامی من ناگۆڕدرێت﴾ پاشان گەڕامەوە بۆ لای مووسا فەرمووی : بگەڕێوە بۆ لای پەروەردگارت ووتم : بەڕاستی شەرم لە پەروەردگارم دەكەم ، پاشان جیبریل بردمی تا گەیشتمە (سدرة المنتهی)[1] كە هێندە بە شتی ڕەنگاوڕەنگ داپۆشرابوو نازانم چۆن بوو ، پاشان بردیانمە بەهەشت بینینم ملوانكەی مرواری تیا بوو ، وە خاكەكەی میسك بوو.

## چیرۆكی سێ یەم

## پلەو پایەی شەو نوێژ

**عَنِ ابْنِ عُمَرَ ـ رضى الله عنهما ـ قَالَ كَانَ الرَّجُلُ فِي حَيَاةِ النَّبِيِّ ﷺ إِذَا رَأَى رُؤْيَا قَصَّهَا عَلَى النَّبِيِّ ﷺ، فَتَمَنَّيْتُ أَنْ أَرَى رُؤْيَا أَقُصُّهَا عَلَى النَّبِيِّ ، وَكُنْتُ غُلاَمًا شَابًّا أَعْزَبَ، وَكُنْتُ أَنَامُ فِي الْمَسْجِدِ عَلَى عَهْدِ النَّبِيِّ ﷺ فَرَأَيْتُ فِي الْمَنَامِ كَأَنَّ مَلَكَيْنِ أَخَذَانِي فَذَهَبَا بِي إِلَى النَّارِ، فَإِذَا هِيَ مَطْوِيَّةٌ كَطَىِّ الْبِئْرِ، وَإِذَا لَهَا قَرْنَانِ كَقَرْنَىِ الْبِئْرِ، وَإِذَا فِيهَا نَاسٌ قَدْ عَرَفْتُهُمْ، فَجَعَلْتُ أَقُولُ أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ، أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ النَّارِ. فَلَقِيَهُمَا مَلَكٌ آخَرُ فَقَالَ لِي لَنْ تُرَاعَ. فَقَصَصْتُهَا عَلَى حَفْصَةَ. فَقَصَّتْهَا حَفْصَةُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقَالَ ( نِعْمَ الرَّجُلُ عَبْدُ اللَّهِ، لَوْ كَانَ يُصَلِّي بِاللَّيْلِ ) قَالَ سَالِمٌ فَكَانَ عَبْدُ اللَّهِ لاَ يَنَامُ مِنَ اللَّيْلِ إِلاَّ قَلِيلاً. ( البخاري/ ٣٤٥٧ )**

ئیبن عومەر خوایان لێ ڕازی بێت فەرمووی : هەر پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) خەونی بدیایە دەیگێڕایەوە بۆ پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)منیش خۆزگەم دەخواست خەونێك ببینم و بیگێڕمەوە بۆ پێغەمبەر (ﷺ) لەو كاتەدا من منداڵێكی دەستە هەرزەكار بووم ، و لە سەردەمی پێغەمبەردا(ﷺ) لە مزگەوتدا دەنوستم . لە خەودا بینیم وەكو دوو فریشتە وابوون دەستیان گرتم و بردیانم بۆ لای ئاگرێك وەك بیر ئەم لاو لای بینا كرابوو وە دوو شاخی هەبوو وە ئەو دوو دارەی بەسەر بیرەوەیە (كە بەكرەكەی پێوە بەستراوە) وە كۆمەڵێ خەڵكی تیا بوو دەم ناسین ، منیش دەستم كردە دوعا كردن (پەنا ئەگرم بەخوا لە ئاگر) ، پاشان فریشتەیەكی تریان

(١) سدر : جۆرە درەختێكە

پێگه‌یشت به منی ووت : مه‌ترسه . منیش بۆ (حفصه) م گێڕایه‌وه ئه‌ویش گێڕایه‌وه بۆ پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی: ( به ڕاستی عبدالله پیاوێكی بیٚ وێنه‌یه ئه‌گه‌ر شه‌ونوێژ بكات )
سالم ده‌ڵێت : ئیتر عبدالله عاده‌تی وابوو به‌شه‌ودا كه‌مێك ده‌نووست .

## چیرۆكی چواره‌م

## پله‌و پایه‌ی چاكه‌كردن له‌گه‌ڵ كچاندا

**عَنْ عُرْوَةَ، عَنْ عَائِشَةَ ـ رضي الله عنها ـ قَالَتْ دَخَلَتِ امْرَأَةٌ مَعَهَا ابْنَتَانِ لَهَا تَسْأَلُ، فَلَمْ تَجِدْ عِنْدِي شَيْئًا غَيْرَ تَمْرَةٍ فَأَعْطَيْتُهَا إِيَّاهَا، فَقَسَمَتْهَا بَيْنَ ابْنَتَيْهَا وَلَمْ تَأْكُلْ مِنْهَا، ثُمَّ قَامَتْ فَخَرَجَتْ، فَدَخَلَ النَّبِيُّ ﷺ عَلَيْنَا، فَأَخْبَرْتُهُ فَقَالَ ( مَنِ ابْتُلِيَ مِنْ هَذِهِ الْبَنَاتِ بِشَىْءٍ كُنَّ لَهُ سِتْرًا مِنَ النَّارِ ). ( البخاري/ ١٤١٨ )**

له (عروه) وه ئه‌ویش له عائیشه‌وه (خوایان لیٚ ڕازی بێت) ده‌فه‌رموێت : ئافره‌تێك هات بۆ ماڵمان دوو كچی خۆی له‌گه‌ڵ دا بوو سواڵی ده‌كرد منیش جگه له خورمایه‌ك هیچی ترم لا نه‌بوو ، دام پیٚ ی ، ئه‌ویش كردی به دوو له‌ته‌وه و دای به كچه‌كانی وه خۆی هیچی لیٚ نه‌خوارد پاشان هه‌ستاو چووه ده‌ره‌وه ، پاشان پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) هاته‌وه ، منیش هه‌واڵم دایه ، فه‌رمووی : (هه‌ركه‌سێك خوای گه‌وره له‌م كچانه‌ی پیٚ به‌خشی ده‌بنه به‌ربه‌ستێك بۆی له ئاگری دۆزه‌خ)

## چیرۆكی پێنجه‌م

## پله و پایه‌ی خێركردن

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ رضى الله عنه ـ أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ ( رَجُلٌ لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدِ سَارِقٍ فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ عَلَى سَارِقٍ. فَقَالَ اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ لأَتَصَدَّقَنَّ بِصَدَقَةٍ. فَخَرَجَ بِصَدَقَتِهِ فَوَضَعَهَا فِي يَدَىْ زَانِيَةٍ، فَأَصْبَحُوا يَتَحَدَّثُونَ تُصُدِّقَ اللَّيْلَةَ**

**على زانية. فقال اللهمَّ لكَ الحمْدُ على زانية، لأتصدَّقنَّ بصدقة. فخرج بصدقته فوضعها في يدَيْ غنيّ فأصبحوا يتحدثون تُصُدِّقَ على غنيّ فقال اللهم لكَ الحمْدُ، على سارق وعلى زانية وعلى غنيّ. فأتي فقيلَ لهُ أمّا صدقتك على سارق فلعلّهُ أنْ يستعفَّ عنْ سرقته، وأمّا الزانيةُ فلعلّها أنْ تستعفَّ عنْ زناها، وأمّا الغنيُّ فلعلّهُ يعتبرُ فيُنْفقُ ممّا أعطاهُ اللهُ ) .( البخاري/ ١٤٢١ )**

له ئه‌بو هوره‌یره‌وه خوای لیّ ڕازی بێت كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رموویه‌تی:

(پیاوێك ووتی بڕیار بێت خێرێك بكه‌م ، خێره‌كه‌ی هه‌ڵگرت و به‌خشی به دزێك ، خه‌ڵكی كه‌وتنه باس و خواس ووتیان خێر دراوه به دزێك ، پیاوه‌كه ووتی خوایه شوكر بۆ تۆ بڕیار بێت خێرێك بكه‌م ، خێره‌كه‌ی هه‌ڵگرت و به‌خشی به ئافره‌تێكی داوێن پیس خه‌ڵكی كه‌وتنه‌وه باس و خواس ووتیان ئه‌مشه‌و خێر به ئافره‌تێكی داوێن پیس كراوه كابرا ووتی خوایه سوپاس بۆ تۆ بڕیار بێت خێرێك بكه‌م ، خێره‌كه‌ی هه‌ڵگرت و به‌خشی به ده‌وڵه‌مه‌ندێك ، خه‌ڵكی كه‌وتنه قسه و باس ووتیان خێر به ده‌وڵه‌مه‌ندێك كراوه .

كابرا ووتی: خوایه سوپاس بۆ تۆ له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی خێره‌كه درا به دزێك و ئافره‌تێكی به‌دڕه‌وشت و ده‌وڵه‌مه‌ندێك ، كه‌سێك هاته لای پیّ ی ووت : ئه‌و خێره‌ی به‌خشیت به دزه‌كه سا به‌ڵكو واز له دزی بێنێت ، به نیسبه‌ت ئافره‌ته به‌دڕه‌وشته‌كه به‌ڵكو ئه‌ویش واز له زینا بێنێت . به نیسبه‌ت پیاوه ده‌وڵه‌مه‌نده‌كه‌ش سا به‌ڵكو ئه‌وه ببێته په‌ندێك بۆی و له‌و ماڵه‌ی خوا پیّ ی به‌خشیوه ببه‌خشیّ).

إبن حجر فه‌رمویه‌تی: ئه‌و پیاوه نه‌یده‌زانی كابرای یه‌كه‌م دزه و ئافره‌ته داوێن پیسه و پیاوی سیّ یه‌میش ده‌وڵه‌مه‌نده . به‌ڵكو خوا خۆی به نسیبی ئه‌وانی كرد .

## چیرۆكی شه‌شه‌م

## ڕاستگۆیه‌ك و دوو شه‌هید

**عنْ سعيد، عَنْ قَتَادَةَ، أَنَّ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ـ رضى الله عنه ـ حَدَّثَهُمْ أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ صَعِدَ أُحُدًا وَأَبُو بَكْرٍ وعُمَرُ وعُثْمَانُ فَرَجَفَ بِهِمْ فَقَالَ ( اثْبُتْ أُحُدُ فَإِنَّمَا عَلَيْكَ نَبِيٌّ وَصِدِّيقٌ وَشَهِيدَانِ ). (البخاري/ ٣٦٧٥)**

له سه‌عید ئه‌ویش له قه‌تاده‌وه (ڕه‌حمه‌تی خوایان لێ بێت) ده‌گێڕنه‌وه كه ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) بۆی باس كردوون كه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) له‌گه‌ڵ ئه‌بو به‌كر و عومه‌ر و عوسماندا چونه سه‌ر كێوی ئوحود ، ئه‌ویش له‌رزه‌ی پێ خستن ، پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی : ( ئه‌ی ئوحود جێگیر به (جوڵه جوڵ مه‌كه) بێگومان ته‌نها پێغه‌مبه‌رێك و ڕاستگۆیه‌ك و دوو شه‌هید له‌سه‌رتن)

## چیرۆكی حه‌وته‌م

## موصعه‌بی كوڕی عومه‌یر شێره كوڕه‌كه‌ی مه‌ككه

**عنْ شَقِيقٍ، عَنْ خَبَّابٍ ـ رضى الله عنه ـ قَالَ هَاجَرْنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ و نحن نَبْتَغِي وَجْهَ اللَّهِ، فَوَجَبَ أَجْرُنَا عَلَى اللَّهِ، فَمِنَّا مَنْ مَضَى أَوْ ذَهَبَ لَمْ يَأْكُلْ مِنْ أَجْرِهِ شَيْئًا، كَانَ مِنْهُمْ مُصْعَبُ بْنُ عُمَيْرٍ قُتِلَ يَوْمَ أُحُدٍ، فَلَمْ يَتْرُكْ إِلاَّ نَمِرَةً، كُنَّا إِذَا غَطَّيْنَا بِهَا رَأْسَهُ خَرَجَتْ رِجْلاَهُ، وَإِذَا غُطِّيَ بِهَا رِجْلاَهُ خَرَجَ رَأْسُهُ، فَقَالَ لَنَا النَّبِيُّ ﷺ ( غَطُّوا بِهَا رَأْسَهُ، وَاجْعَلُوا عَلَى رِجْلِهِ الإِذْخِرَ ) أَوْ قَالَ ( أَلْقُوا عَلَى رِجْلِهِ مِنَ الإِذْخِرِ ). وَمِنَّا مَنْ أَيْنَعَتْ لَهُ ثَمَرَتُهُ فَهْوَ يَهْدِبُهَا. (البخاري/ ٤٠٨٢)**

شه‌قیق (ڕه‌حمه‌تی خوای لێ بێت) له خه‌ببابه‌وه (خوای لێ ڕازی بێت) ده‌گێڕێته‌وه ده‌فه‌رموێت : (ئێمه له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌ردا (ﷺ) له به‌ر ڕه‌زامه‌ندیی خوا كۆچمان كرد بۆیه پاداشتمان لای خوای گه‌وره مسۆگه‌ر بوو جا هه‌ندێكمان وه‌فاتی كرد یان ڕۆیشت و هیچی له پاداشته‌كه‌ی ده‌سگیر نه‌بوو (واته له دونیادا ) یه‌كێك له‌وانه (موصعه‌بی كوڕی عومه‌یر) بوو له جه‌نگی ئوحوددا شه‌هید

بوو هیچی لێ بەجێ نەما جگە لە کراسەکەی جا ئەگەر سەریمان پێ داپۆشیایە قاچەکانی دەردەکەوت وە ئەگەر قاچەکانیمان داپۆشیایە سەری دەردەکەوت پێغەمبەریش (ﷺ) پێ ی فەرمووین :

(سەری بەو پۆشاکەی داپۆشن و (إذخر) بدەن بەسەر قاچەکانیدا )

تێبینی : (إذخر) جۆرە گژ و گیایەکە.

## چیرۆکی هەشتەم

## بەرەکەتی ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت)

**عَنْ عَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ أَبِي بَكْرٍ، أَنَّ أَصْحَابَ الصُّفَّةِ، كَانُوا أُنَاسًا فُقَرَاءَ، وَأَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ (مَنْ كَانَ عِنْدَهُ طَعَامُ اثْنَيْنِ فَلْيَذْهَبْ بِثَالِثٍ، وَإِنْ أَرْبَعٌ فَخَامِسٌ أَوْ سَادِسٌ ) . وَأَنَّ أَبَا بَكْرٍ جَاءَ بِثَلاَثَةٍ فَانْطَلَقَ النَّبِيُّ ﷺ بِعَشَرَةٍ، قَالَ فَهْوَ أَنَا وَأَبِي وَأُمِّي، فَلاَ أَدْرِي قَالَ وَامْرَأَتِي وَخَادِمٌ بَيْنَنَا وَبَيْنَ بَيْتِ أَبِي بَكْرٍ. وَإِنَّ أَبَا بَكْرٍ تَعَشَّى عِنْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم ثُمَّ لَبِثَ حَيْثُ صُلِّيَتِ الْعِشَاءُ، ثُمَّ رَجَعَ فَلَبِثَ حَتَّى تَعَشَّى النَّبِيُّ ﷺ فَجَاءَ بَعْدَ مَا مَضَى مِنَ اللَّيْلِ مَا شَاءَ اللَّهُ. قَالَتْ لَهُ امْرَأَتُهُ وَمَا حَبَسَكَ عَنْ أَضْيَافِكَ أَوْ قَالَتْ ضَيْفِكَ قَالَ أَوَمَا عَشَّيْتِيهِمْ قَالَتْ أَبَوْا حَتَّى تَجِيءَ، قَدْ عُرِضُوا فَأَبَوْا. قَالَ فَذَهَبْتُ أَنَا فَاخْتَبَأْتُ فَقَالَ يَا غُنْثَرُ، فَجَدَّعَ وَسَبَّ، وَقَالَ كُلُوا لاَ هَنِيئًا. فَقَالَ وَاللَّهِ لاَ أَطْعَمُهُ أَبَدًا، وَايْمُ اللَّهِ مَا كُنَّا نَأْخُذُ مِنْ لُقْمَةٍ إِلاَّ رَبَا مِنْ أَسْفَلِهَا أَكْثَرُ مِنْهَا. قَالَ يَعْنِي حَتَّى شَبِعُوا وَصَارَتْ أَكْثَرَ مِمَّا كَانَتْ قَبْلَ ذَلِكَ، فَنَظَرَ إِلَيْهَا أَبُو بَكْرٍ فَإِذَا هِيَ كَمَا هِيَ أَوْ أَكْثَرُ مِنْهَا. فَقَالَ لاِمْرَأَتِهِ يَا أُخْتَ بَنِي فِرَاسٍ مَا هَذَا قَالَتْ لاَ وَقُرَّةِ عَيْنِي لَهِيَ الآنَ أَكْثَرُ مِنْهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِثَلاَثِ مَرَّاتٍ. فَأَكَلَ مِنْهَا أَبُو بَكْرٍ وَقَالَ إِنَّمَا كَانَ ذَلِكَ مِنَ الشَّيْطَانِ ـ يَعْنِي يَمِينَهُ ـ ثُمَّ أَكَلَ مِنْهَا لُقْمَةً، ثُمَّ حَمَلَهَا إِلَى النَّبِيِّ ﷺ فَأَصْبَحَتْ عِنْدَهُ، وَكَانَ بَيْنَنَا وَبَيْنَ قَوْمٍ عَقْدٌ، فَمَضَى الأَجَلُ، فَفَرَّقَنَا اثْنَا عَشَرَ رَجُلاً، مَعَ كُلِّ رَجُلٍ مِنْهُمْ أُنَاسٌ، اللَّهُ أَعْلَمُ كَمْ مَعَ كُلِّ رَجُلٍ فَأَكَلُوا مِنْهَا أَجْمَعُونَ، أَوْ كَمَا قَالَ.**

**( البخاري/ ٦٠٢ )**

عه‌بدوڕه‌حمانی كوڕی ئه‌بوبه‌كر (خوایان لیّ ڕازی بیّت) ده‌گیّڕیّته‌وه كه (أصحاب الصفه) خاوه‌نانی سوففه خه‌لْكیّكی هه‌ژار بوون ، پیّغه‌مبه‌ریش (ﷺ) فه‌رمووی (هه‌ركه‌س خواردنی دوو كه‌سی هه‌یه با كه‌سی سیّیه‌میش له‌گه‌لْ خۆیدا بباته‌وه ، وه ئه‌گه‌ر خواردنی چوار كه‌سی بوو با كه‌سی پیّنجه‌م یان شه‌شه‌میش بباته‌وه) جا ئه‌بوبه‌كریش (خوای لیّ ڕازی بیّت) سیّ كه‌سی برده‌وه له‌گه‌لْ خۆی به‌لاّم پیّغه‌مبه‌ر (ﷺ) ده كه‌سی برده‌وه.

## چیرۆكی نۆیه‌م

## به‌ره‌كه‌تی دوعای پیاوچاكان

**عنْ أنس بْن مَالك، قَالَ أصَابَت النَّاسَ سَنَةٌ عَلَى عَهْد النَّبيّ ﷺ فبيْنا النَّبيُّ ﷺ يَخطُبُ في يَوْم جُمُعة قَامَ أعْرَابيٌّ فقَالَ يَا رَسُولَ اللّه هَلكَ المَالُ وَجَاعَ العيَالُ، فَادْعُ اللّهَ لنَا. فرفَعَ يَدَيْه، وَمَا نرى في السَّمَاء قَزَعَةً، فوَالّذي نَفسي بيَده مَا وَضَعَهَا حَتّى ثَارَ السَّحَابُ أمْثَالَ الجبَال، ثُمَّ لَمْ ينْزلْ عَنْ منْبَره حَتّى رَأيْتُ المَطرَ يَتحَادَرُ عَلَى لحْيَته فمُطرْنا يَوْمَنَا ذلكَ، وَمنَ الغَد، وَبَعْدَ الغَد والّذي يَليه، حَتّى الجُمُعَة الأخْرَى، وَقَامَ ذلكَ الأعْرَابيُّ ـ أوْ قَالَ غَيْرُهُ ـ فقَالَ يَا رَسُولَ اللّه، تهدَّمَ البنَاءُ وَغَرقَ المَالُ، فَادْعُ اللّهَ لَنَا. فرَفعَ يَدَيْه، فقَالَ ( اللّهُمَّ حَوَاليْنَا، وَلاَ عَليْنَا ). فمَا يُشيرُ بيَده إلَى نَاحيَة منَ السَّحَاب إلاّ انْفرَجَتْ، وَصَارَت المَدينَةُ مثْلَ الجَوْبَة، وَسَالَ الوَادي قَنَاةُ شَهْرًا، وَلَمْ يَجئْ أحَدٌ منْ نَاحيَة إلاّ حَدَّثَ بالجَوْد. (البخاري/ ٨٨١ )**

ئه‌نه‌سی كوڕی مالیك ده‌گیّڕیّته‌وه كه خه‌لْكی له سه‌رده‌می پیّغه‌مبه‌ردا (ﷺ) تووشی ووشكه سالّی یه‌ك هاتن ، ڕۆژیّكی جومعه پیّغه‌مبه‌ر (ﷺ) ووتاری ده‌دا ، كابرایه‌كی ده‌شته‌كی هه‌ستایه سه‌ر پیّ و ووتی : (ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا مالّ و سامانمان فه‌وتا ژن و منداڵمان تووشی برسیّتی هاتوون جا بۆمان بپاڕیّره‌وه له خوا (فریامان كه‌ویّت و ڕزگارمان كات) . پیّغه‌مبه‌ریش (ﷺ) هه‌ردوو ده‌ستی به‌رز كرده‌وه له‌و كاته‌دا ئاسمان هیچ هه‌وریّكی تیّدا نه‌بوو ، جا سویّند به‌و كه‌سه‌ی گیانی منی به‌ده‌سته ، هیّشتا پیّغه‌مبه‌ر ده‌ستی نه‌وی نه‌كردبوو هه‌ور به ویّنه‌ی شاخه‌كان كه‌وته هه‌ژان پاشان هیّشتا دانه‌به‌زیبوو له مینبه‌ره‌كه‌ی تا بینیم باران له ڕیشی

پیرۆزی ده‌تكا ، ئه‌و ڕۆژه‌ بارانمان بۆ باری هه‌روه‌ها سبه‌ینیٚ وه‌ پاشی سبه‌ینیٚ و ڕۆژانی دوای ئه‌ویش تا جومعه‌ی داهاتوو .

ئینجا ئه‌و كابرا ده‌شته‌كیه‌ یان یه‌كێكی تر هه‌ستایه‌ سه‌رپیٚ و ووتی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ماڵه‌كانمان ڕووخان و كه‌ل و په‌ل و كاڵاكانمان نوقم بوون بۆمان بپاڕێره‌وه‌ له‌ خوا.

پێغه‌مبه‌ریش (ﷺ) ده‌ستی به‌رز كرده‌وه‌ و فه‌رمووی :

(ئه‌ی خوای گه‌وره‌ بارانه‌كه‌ به‌ریت بۆ ده‌وروو به‌رمان و له‌سه‌ر خۆمانی لاببه‌یت) جا به‌ ده‌ستی بۆ هه‌ر لایه‌ك ئاماژه‌ی بكردایه‌ له‌ هه‌وره‌كه‌ ده‌ره‌ویه‌وه‌ تا مه‌دینه‌ وه‌كو (الجوبه) ی لیٚ هات وه‌ ئه‌و شیوه‌ تا یه‌ك مانگ ئاوی پێدا ده‌ڕۆیشت (لافاوێكی وا گه‌وره‌ی دروست كرد). هه‌ركه‌سێكیش له‌ هه‌ر لایه‌كه‌وه‌ بهاتایه‌ باسی ئه‌و خێر و به‌ره‌كه‌ته‌ی ده‌كرد .

## چیرۆكی ده‌یه‌م

## داد په‌روه‌ری له‌ نێوان نه‌وه‌كاندا

**عَنْ حُصَيْنٍ، عَنْ عَامِرٍ، قَالَ سَمِعْتُ النُّعْمَانَ بْنَ بَشِيرٍ ـ رضى الله عنهما ـ وَهُوَ عَلَى الْمِنْبَرِ يَقُولُ أَعْطَانِي أَبِي عَطِيَّةً، فَقَالَتْ عَمْرَةُ بِنْتُ رَوَاحَةَ لاَ أَرْضَى حَتَّى تُشْهِدَ رَسُولَ اللَّهِ . فَأَتَى رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ إِنِّي أَعْطَيْتُ ابْنِي مِنْ عَمْرَةَ بِنْتِ رَوَاحَةَ عَطِيَّةً، فَأَمَرَتْنِي أَنْ أُشْهِدَكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. قَالَ ( أَعْطَيْتَ سَائِرَ وَلَدِكَ مِثْلَ هَذَا ) . قَالَ لاَ. قَالَ ( فَاتَّقُوا اللَّهَ، وَاعْدِلُوا بَيْنَ أَوْلاَدِكُمْ ). قَالَ فَرَجَعَ فَرَدَّ عَطِيَّتَهُ. ( البخاري/ ٢٥٨٧ )**

(حصین) له‌ عامره‌وه‌ (ڕه‌حمه‌تی خوایان لیٚ بێت) ده‌گێڕێته‌وه‌ ده‌ڵێت: گوێم له‌ نوعمانی كوڕی به‌شیر بوو (خوای لیٚ ڕازی بێت) له‌و كاته‌دا له‌سه‌ر مینبه‌ر بوو ده‌یفه‌رموو باوكم شتێكی پیٚ به‌خشیم ، به‌ڵام دایكم كه‌ (عه‌مره‌ی كچی ڕه‌واحه‌) بوو فه‌رمووی : من به‌وه‌ ڕازی نیم تا پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) نه‌كه‌یت به‌ شاهید ، ئه‌ویش هات بۆ خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) و فه‌رمووی : من شتێكم به‌خشیوه‌ به‌م كوڕه‌م كه‌ له‌ عه‌مره‌ی كچی ڕه‌واحه‌یه‌ ، ئه‌ویش داوای لیٚ كردووم تۆ بكه‌م

بە شاهید ئەی پێغەمبەری خوا ئەویش فەرمووی : ( ئایا شتی ترت لە وێنەی ئەمە بە خشیوە بە بەوەكانی ترت؟) ووتی : نەخێر.

فەرمووی (دەی لە خوا بترسن و داد پەروەر بن لە نێوان منداڵەكانتاندا) دەڵێت : ئەویش گەڕایەوە و بەخششەكەی ڕەت كردەوە.

## چیرۆكی پانزەهەم

## ئەوە سامانێكی بەسود و قازانجە

**عن إسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، أَنَّهُ سَمِعَ أَنَسَ بْنَ مَالِكٍ ـ رضى الله عنه ـ يَقُولُ كَانَ أَبُو طَلْحَةَ أَكْثَرَ الأَنْصَارِ بِالْمَدِينَةِ مَالاً مِنْ نَخْلٍ، وَكَانَ أَحَبُّ أَمْوَالِهِ إِلَيْهِ بَيْرُحَاءَ وَكَانَتْ مُسْتَقْبِلَةَ الْمَسْجِدِ، وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُهَا وَيَشْرَبُ مِنْ مَاءٍ فِيهَا طَيِّبٍ قَالَ أَنَسٌ فَلَمَّا أُنْزِلَتْ هَذِهِ الآيَةُ ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ قَامَ أَبُو طَلْحَةَ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ. إِنَّ اللَّهَ تَبَارَكَ وَتَعَالَى يَقُولُ ﴿لَنْ تَنَالُوا الْبِرَّ حَتَّى تُنْفِقُوا مِمَّا تُحِبُّونَ﴾ وَإِنَّ أَحَبَّ أَمْوَالِي إِلَىَّ بَيْرُحَاءَ، وَإِنَّهَا صَدَقَةٌ لِلَّهِ أَرْجُو بِرَّهَا وَذُخْرَهَا عِنْدَ اللَّهِ، فَضَعْهَا يَا رَسُولَ اللَّهِ حَيْثُ أَرَاكَ اللَّهُ. قَالَ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ( بَخْ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، ذَلِكَ مَالٌ رَابِحٌ، وَقَدْ سَمِعْتُ مَا قُلْتَ وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَجْعَلَهَا فِي الأَقْرَبِينَ ). فَقَالَ أَبُو طَلْحَةَ أَفْعَلُ يَا رَسُولَ اللَّهِ. فَقَسَمَهَا أَبُو طَلْحَةَ فِي أَقَارِبِهِ وَبَنِي عَمِّهِ. تَابَعَهُ رَوْحٌ. وَقَالَ يَحْيَى بْنُ يَحْيَى وَإِسْمَاعِيلُ عَنْ مَالِكٍ رَايِحٌ. ( البخاري/ ١٤٦١ )**

ئیسحاق كوڕی عەبدوللا كوڕی ئەبو تەڵحە (خوا لێ یان ڕازی بێت) دەیفەرموو ئەبو تەڵحە لە مەدینە دا لە هەموو ئەنساری یەكان سەروەتی دارخورمای زیاتر بوو وە لەناو ماڵ و سامانەكەیدا باخی (بەیروحا) ی لە هەمووی زیاتر خۆش دەویست ، وە بەرامبەر مزگەوتەكە بوو ، پێغەمبەریش (ﷺ) دەچووە ناوی و ئاوێكی سازگاری لێ بوو لێ ی دەخواردەوە ئەنەس دەڵێت : كە ئەم ئایەتە دابەزی ﴿لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون﴾ ئەبو تەڵحە هەستا هاتە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا ، خوای گەورە دەفەرموێت : ﴿لن تنالوا البر حتى تنفقوا مما تحبون﴾ منیش بەیروحام لە هەموو ماڵێكی دونیام خۆشتر

ده‌وێت ، ئه‌وا كردمه خێر و سه‌ده‌قه بۆ خوا و ئومێدم به پاداشت و توێشوه‌كه‌ی هه‌یه له لای خوا ، جا ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ، خوای گه‌وره چۆنی پێ خۆشه وای لێ بكه.
ووتی: ئینجا پێغه‌مبه‌ر فه‌رمووی (به‌خ ئه‌وه سامانێكی به سوود و قازانجه ، ئه‌وه سامانێكی به‌سوود و قازانجه ، وه من گوێم لێ بوو چیت ووت ، پێم باشه به‌سه‌ر خزمه‌كانتدا دابه‌شی بكه‌یت) ئیتر ئه‌بو ته‌ڵحه به‌خشی به خزمه‌كان و ئامۆزاكانی .

## چیرۆكی دوانزه‌هه‌م

## كێ چاكترین كه‌سه

**عَنْ عُقَيْلٍ، عَنِ ابْنِ شِهَابٍ، قَالَ أَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عُتْبَةَ، أَنَّ أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ ـ رضى الله عنه ـ قَالَ حَدَّثَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثًا طَوِيلاً عَنِ الدَّجَّالِ، فَكَانَ فِيمَا حَدَّثَنَا بِهِ أَنْ قَالَ ( يَأْتِي الدَّجَّالُ ـ وَهُوَ مُحَرَّمٌ عَلَيْهِ أَنْ يَدْخُلَ نِقَابَ الْمَدِينَةِ ـ بَعْضَ السِّبَاخِ الَّتِي بِالْمَدِينَةِ، فَيَخْرُجُ إِلَيْهِ يَوْمَئِذٍ رَجُلٌ، هُوَ خَيْرُ النَّاسِ ـ أَوْ مِنْ خَيْرِ النَّاسِ ـ فَيَقُولُ أَشْهَدُ أَنَّكَ الدَّجَّالُ، الَّذِي حَدَّثَنَا عَنْكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ حَدِيثَهُ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ أَرَأَيْتَ إِنْ قَتَلْتُ هَذَا ثُمَّ أَحْيَيْتُهُ، هَلْ تَشُكُّونَ فِي الأَمْرِ فَيَقُولُونَ لاَ. فَيَقْتُلُهُ، ثُمَّ يُحْيِيهِ فَيَقُولُ حِينَ يُحْيِيهِ وَاللَّهِ مَا كُنْتُ قَطُّ أَشَدَّ بَصِيرَةً مِنِّي الْيَوْمَ، فَيَقُولُ الدَّجَّالُ أَقْتُلُهُ فَلاَ أُسَلَّطُ عَلَيْهِ ).( البخاري/ ١٨٨٢ )**

عوقه‌یل له ئیبن شه‌هابه‌وه ده‌گێڕێته‌وه ده‌ڵێت : عوبه‌یدوڵڵای كوڕی عه‌بدوڵڵای كوڕی عوتبه هه‌واڵی پێدام كه ئه‌بو سه‌عیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) فه‌رمووی:
پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) به درێژی باسی ده‌ججالی بۆ كردین له میانه‌ی ئه‌وه‌ی بۆی باس كردین فه‌رمووی : (ده‌ججال دێت له كاتێكدا حه‌رام كراوه له‌سه‌ری بچێته ناو مه‌دینه‌وه له هیچ ده‌روازه و ڕێگه‌یه‌كه‌وه ناچار ده‌چێت له نزیكی مه‌دینه له شوێنێكدا له زه‌ویه‌كدا داده‌به‌زێت كه هیچی تیا سه‌وز نابێت و وه‌ك (مملحه) وایه له‌و كاته‌دا پیاوێك له‌ناو خه‌ڵكه‌كه‌دا دێته ده‌ره‌وه و به‌ره‌و ڕووی ده‌بێته‌وه كه چاكترین كه‌سه یان یه‌كێكه له كه‌سه هه‌ره چاكه‌كان و پێ ی ده‌ڵێت شایه‌تی ده‌ده‌م كه تۆ ئه‌و ده‌ججاله‌ی كه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) بۆی باس كردوین هه‌واڵی پێداوین .

دەججال دەڵێت: ئایا ئەگەر بینیتان ئەم كابرایەم كوشت پاشان زیندوم كردەوە ئایا گومانتان لە مەسەلەكە دەمێنێت ؟ ئەوانیش دەڵێن : نەخێر ، دەسبەجێ دەیكوژێ و پاشان زیندووی دەكاتەوە ، ئەو پیاوە كاتێ دەججال زیندووی دەكاتەوە دەڵێت : سوێند بەخوا هەرگیز لە ئەمڕۆ رباتر بەرچاوم ڕوون نەبووە و (ڕاستی یەكانی ئیمانم بەو جۆرە بۆ ئاشكرا نەبووە)، دەجالیش دەڵێت : دەمەوێ بیكوژم بەڵام دەسەڵاتم بەسەریدا نی یە.

## چیرۆكی سیانزەهەم

## سەلمان ڕاست ئەكات

**عنْ عوْن بْن أبي جُحيْفَةَ ، عَنْ أبيه، قَالَ آخى النَّبيُّ ﷺ بيْنَ سَلْمَانَ وَأَبي الدَّرْدَاء. فَزَارَ سَلْمَانُ أَبَا الدَّرْدَاء فرَأى أمَّ الدَّرْدَاء مُتَبَذِّلَةً فقَالَ لَهَا مَا شَأنُك قَالَتْ أخُوكَ أبُو الدَّرْدَاء لَيْسَ لَهُ حَاجَةٌ فِي الدُّنْيَا. فجَاءَ أبُو الدَّرْدَاء فَصَنَعَ لَهُ طَعَامًا فَقَالَ كُلْ قَالَ فَإِنِّي صَائمٌ. قَالَ مَا أنَا بِآكِلٍ حَتَّى تَأكُل. قَالَ فأكَلَ، فلَمَّا كَانَ اللَّيْلُ ذَهَبَ أبُو الدَّرْدَاء يَقُومُ قَالَ نَمْ. فنَامَ، ثُمَّ ذَهَبَ يَقُومُ فقَالَ نَمْ. فلمَّا كَانَ من آخرُ اللَّيْلِ قَالَ سَلْمَانُ قُم الآنَ. فَصَلَّيَا فَقَالَ لَهُ سَلْمَانُ إنَّ لِرَبِّكَ عَلَيْكَ حَقًّا، وَلنَفْسكَ عليكَ حَقًّا، وَلأهْلكَ عَلَيْكَ حَقًّا، فَأعْطِ كُلَّ ذِي حَقٍّ حَقَّهُ. فَأتَى النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرَ ذَلكَ لَهُ. فَقَالَ النَّبيُّ ﷺ صَدَقَ سَلْمَانُ . (البخاري/ ١٩٦٨)**

عەون كوڕی ئەبو جوحەیفە لە باوكیەوە دەگێڕێتەوە كە :

پێغەمبەر (ﷺ) برایەتی ی كرد لە نێوان سەلمان و ئەبو دەردا دا (لەو كاتەدا كە دوو دوو موسوڵمانانی كردە برای یەكتر ، كۆچ كەرێك و پشتیوانێك) جا سەلمان سەردانێكی ماڵی ئەبو دەردای كرد ، بینی ئوم دەردا شڕ و شێوا وشپرزەیە پێ ی ووت : ئەوە بۆ وات لێ هاتووە ؟ ووتی : ئەبو دەردای برات هیچ ئیشێكی بە دونیا نیە ، ئەبو دەردا لەو كاتەدا هاتەوە و خواردنێكی بۆ دروست كرد . سەلمان ووتی : بخۆ ، ووتی : من بەڕۆژووم ووتی: منیش نان ناخۆم تا خۆیشت نەخۆی. ووتی : بەو جۆرە ڕۆژووەكەی شكاند و نانی خوارد . كاتێ شەو

داهات ئه‌بو ده‌ردا ڕۆیشت بۆ ئه‌وه‌ی شه‌و نوێژ بكات ووتی : بخه‌وه پاشان جارێكی تر ویستی بڕوات بۆ شه‌و نوێژ ووتی : بخه‌وه (واته سه‌لمان پێی ووت) .

كاتێ نزیكی كۆتایی شه‌و بووه‌وه : سه‌لمان ووتی: (ئیستا هه‌سته) ئه‌وه‌بوو هه‌ردووكیان نوێژیان كرد .

ئینجا سه‌لمان پێ ی ووت : دڵنیابه په‌روه‌ردگارت مافی هه‌یه له سه‌رت ، وه هاوسه‌رت مافی هه‌یه له سه‌رت . جا تۆش مافی هه‌موو خاوه‌ن مافێك بده .

پاشان ئه‌بو ده‌ردا هاته خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ر و ئه‌و به‌سه‌رهاته‌ی بۆ گێڕایه‌وه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی: (سه‌لمان ڕاست ده‌كات).

## چیرۆكی چوارده‌هه‌م

## له جێ به‌جێ كردنی سزاكانی خوادا تكا كردن نی یه

**عَنْ عَائِشَةَ ـ رضى الله عنها أَنَّ قُرَيْشًا أَهَمَّهُمْ شَأْنُ الْمَرْأَةِ الْمَخْزُومِيَّةِ الَّتِي سَرَقَتْ فَقَالُوا وَمَنْ يُكَلِّمُ فِيهَا رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَقَالُوا : وَمَنْ يَجْتَرِئُ عَلَيْهِ إِلاَّ أُسَامَةُ بْنُ زَيْدٍ، حِبُّ رَسُولِ اللَّهِ ، فَكَلَّمَهُ أُسَامَةُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ( أَتَشْفَعُ فِي حَدٍّ مِنْ حُدُودِ اللَّهِ ) ثُمَّ قَامَ فَاخْتَطَبَ، ثُمَّ قَالَ : ( إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الْحَدَّ وَايْمُ اللَّهِ، لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ ابْنَةَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا ).( البخاري/ ٣٤٧٥ )**

دایكمان عائیشه خوای لێ ڕازی بێت ده‌فه‌رموێت ئه‌و ئافره‌ته مه‌خزومیه‌ی دزی كرد هۆزی قوڕه‌یشی زۆر غه‌مبار كرد و پێوه‌ی سه‌رقاڵ بوون ووتیان : كێ بچێت تكای بۆ بكات لای پێغه‌مبه‌ر (واته به مه‌به‌ستی ئه‌وه‌ی ده‌ستی نه‌بڕێت) ووتیان : جگه له ئوسامه‌ی كوڕی زه‌ید كه خۆشه‌ویستی پێغه‌مبه‌ری خوایه (ﷺ) كێ هه‌یه جورئه‌تی ئه‌وه بكات ؟

ئه‌وه‌بوو ئوسامه له‌و باره‌یه‌وه عه‌رزی كرد كه ده‌ستی نه‌بڕێت.

پێغه‌مبه‌ری خواش (ﷺ) فه‌رمووی : (ئایا له جێ به‌جێ كردنی سنوره‌كانی خوادا تكا ده‌كه‌یت؟). پاشان له‌ناو هاوه‌ڵاندا هه‌ستایه سه‌رپێ و ووتاری داو فه‌رمووی :

(بەڕاستی ئوممەتانی پێش ئێوە بەهۆی ئەوەوە لەناو چوون کە عادەتیان وابوو ئەگەر کەسێکی دەسەڵاتدار و خانەدان دزی لەناویاندا بکردایە وازیان لێ دەهێنا و ئەگەر کەسێکی لاواز و بێ دەسەڵاتیش دزی لە ناویاندا بکردایە یاسایان لەسەر جێ بەجێ دەکرد . وە سوێند بەخوا ئەگەر فاتیمەی کچی موحەمەدیش دزی بکات دەستی دەبڕم).

## چیرۆکی پانزەهەم

## کاسبیی حەڵاڵ و لە خواترسانی ئەبو بەکر (خوای لێ ڕازی بێت)

**عنْ عَائِشَةَ ـ رضى الله عنها ـ قَالَتْ كَانَ لأَبِي بَكْرٍ غُلاَمٌ يُخْرِجُ لَهُ الْخَرَاجَ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَأْكُلُ مِنْ خَرَاجِهِ، فَجَاءَ يَوْمًا بِشَىْءٍ فَأَكَلَ مِنْهُ أَبُو بَكْرٍ فَقَالَ لَهُ الْغُلاَمُ أَتَدْرِي مَا هَذَا فَقَالَ أَبُو بَكْرٍ وَمَا هُوَ ؟ قَالَ كُنْتُ تَكَهَّنْتُ لإِنْسَانٍ فِي الْجَاهِلِيَّةِ وَمَا أُحْسِنُ الْكِهَانَةَ، إِلاَّ أَنِّي خَدَعْتُهُ، فَلَقِيَنِي فَأَعْطَانِي بِذَلِكَ، فَهَذَا الَّذِي أَكَلْتَ مِنْهُ. فَأَدْخَلَ أَبُو بَكْرٍ يَدَهُ فَقَاءَ كُلَّ شَىْءٍ فِي بَطْنِهِ.( البخاري/ ٣٨٤٢ )**

دایکی ئیمانداران عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

ئەبوبەکر (خوای لێ ڕازی بێت) شاگردێکی هەبوو هەندێ جار خواردنێکی دەهێنا بۆ ئەبو بەکر و ئەویش لێ ی دەخوارد ، ڕۆژێکیان شتێکی بۆ ئەبو بەکر هێنا لێ ی خوارد پاشان شاگردەکەی پێ ی ووت : دەزانی ئەوەم لە کوێ بوو ؟ فەرمووی : لە کوێت بوو؟ ووتی : لە سەردەمی نەفامیدا فاڵێکم بۆ کابرایەك گرتەوە ، چاکیش لێم نەدەزانی ، بەڵام خەڵەتاندم ، جا پێم گەیشت و ئەوەی دا پێم لە جێ ی ئەو کارە.

پاشان ئەبو بەکر دەستی کرد بەناو دەمیدا و ئەوەی لەناو سکیدا بوو هەمووی ڕشاندەوە.

# چیرۆکی شانزەهەم

## بەسەرهاتی بوختانەکە

عَنْ عَائِشَةَ ـ رضى الله عنها ـ زَوْجِ النَّبِيِّ ﷺ حِينَ قَالَ لَهَا أَهْلُ الإِفْكِ مَا قَالُوا، فَبَرَّأَهَا اللَّهُ مِنْهُ، قَالَ الزُّهْرِيُّ، وَكُلُّهُمْ حَدَّثَنِي طَائِفَةً مِنْ حَدِيثِهَا وَبَعْضُهُمْ أَوْعَى مِنْ بَعْضٍ، وَأَثْبَتُ لَهُ اقْتِصَاصًا، وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْ كُلِّ وَاحِدٍ مِنْهُمُ الْحَدِيثَ الَّذِي حَدَّثَنِي عَنْ عَائِشَةَ، وَبَعْضُ حَدِيثِهِمْ يُصَدِّقُ بَعْضًا. زَعَمُوا أَنَّ عَائِشَةَ قَالَتْ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَخْرُجَ سَفَرًا أَقْرَعَ بَيْنَ أَزْوَاجِهِ، فَأَيَّتُهُنَّ خَرَجَ سَهْمُهَا خَرَجَ بِهَا مَعَهُ، فَأَقْرَعَ بَيْنَنَا فِي غَزَاةٍ غَزَاهَا فَخَرَجَ سَهْمِي، فَخَرَجْتُ مَعَهُ بَعْدَ مَا أُنْزِلَ الْحِجَابُ، فَأَنَا أُحْمَلُ فِي هَوْدَجٍ وَأُنْزَلُ فِيهِ، فَسِرْنَا حَتَّى إِذَا فَرَغَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مِنْ غَزْوَتِهِ تِلْكَ، وَقَفَلَ وَدَنَوْنَا مِنَ الْمَدِينَةِ، آذَنَ لَيْلَةً بِالرَّحِيلِ، فَقُمْتُ حِينَ آذَنُوا بِالرَّحِيلِ، فَمَشَيْتُ حَتَّى جَاوَزْتُ الْجَيْشَ، فَلَمَّا قَضَيْتُ شَأْنِي أَقْبَلْتُ إِلَى الرَّحْلِ، فَلَمَسْتُ صَدْرِي، فَإِذَا عِقْدٌ لِي مِنْ جَزْعِ أَظْفَارٍ قَدِ انْقَطَعَ، فَرَجَعْتُ فَالْتَمَسْتُ عِقْدِي، فَحَبَسَنِي ابْتِغَاؤُهُ، فَأَقْبَلَ الَّذِينَ يَرْحَلُونَ لِي، فَاحْتَمَلُوا هَوْدَجِي فَرَحَلُوهُ عَلَى بَعِيرِي الَّذِي كُنْتُ أَرْكَبُ، وَهُمْ يَحْسِبُونَ أَنِّي فِيهِ، وَكَانَ النِّسَاءُ إِذْ ذَاكَ خِفَافًا لَمْ يَثْقُلْنَ وَلَمْ يَغْشَهُنَّ اللَّحْمُ، وَإِنَّمَا يَأْكُلْنَ الْعُلْقَةَ مِنَ الطَّعَامِ، فَلَمْ يَسْتَنْكِرِ الْقَوْمُ حِينَ رَفَعُوهُ ثِقَلَ الْهَوْدَجِ فَاحْتَمَلُوهُ وَكُنْتُ جَارِيَةً حَدِيثَةَ السِّنِّ، فَبَعَثُوا الْجَمَلَ وَسَارُوا، فَوَجَدْتُ عِقْدِي بَعْدَ مَا اسْتَمَرَّ الْجَيْشُ، فَجِئْتُ مَنْزِلَهُمْ وَلَيْسَ فِيهِ أَحَدٌ، فَأَمَمْتُ مَنْزِلِي الَّذِي كُنْتُ بِهِ فَظَنَنْتُ أَنَّهُمْ سَيَفْقِدُونِي فَيَرْجِعُونَ إِلَيَّ، فَبَيْنَا أَنَا جَالِسَةٌ غَلَبَتْنِي عَيْنَاىَ فَنِمْتُ، وَكَانَ صَفْوَانُ بْنُ الْمُعَطَّلِ السُّلَمِيُّ ثُمَّ الذَّكْوَانِيُّ مِنْ وَرَاءِ الْجَيْشِ، فَأَصْبَحَ عِنْدَ مَنْزِلِي فَرَأَى سَوَادَ إِنْسَانٍ نَائِمٍ فَأَتَانِي، وَكَانَ يَرَانِي قَبْلَ الْحِجَابِ فَاسْتَيْقَظْتُ بِاسْتِرْجَاعِهِ حِينَ أَنَاخَ رَاحِلَتَهُ، فَوَطِئَ يَدَهَا فَرَكِبْتُهَا فَانْطَلَقَ يَقُودُ بِي الرَّاحِلَةَ، حَتَّى أَتَيْنَا الْجَيْشَ بَعْدَ مَا نَزَلُوا مُعَرِّسِينَ فِي نَحْرِ الظَّهِيرَةِ، فَهَلَكَ مَنْ هَلَكَ، وَكَانَ الَّذِي تَوَلَّى الإِفْكَ عَبْدُ اللَّهِ بْنُ أُبَىِّ ابْنُ سَلُولَ، فَقَدِمْنَا الْمَدِينَةَ فَاشْتَكَيْتُ بِهَا شَهْرًا، و النَاس يُفِيضُونَ مِنْ قَوْلِ أَصْحَابِ الإِفْكِ، وَيَرِيبُنِي فِي وَجَعِي أَنِّي لاَ أَرَى مِنَ النَّبِيِّ ﷺ اللُّطْفَ الَّذِي كُنْتُ أَرَى مِنْهُ حِينَ أَمْرَضُ، إِنَّمَا يَدْخُلُ فَيُسَلِّمُ ثُمَّ يَقُولُ ( كَيْفَ تِيكُمْ ( . لاَ أَشْعُرُ بِشَىْءٍ مِنْ ذَلِكَ حَتَّى نَقَهْتُ، فَخَرَجْتُ أَنَا وَأُمُّ مِسْطَحٍ قِبَلَ الْمَنَاصِعِ مُتَبَرَّزُنَا، لاَ نَخْرُجُ إِلاَّ لَيْلاً إِلَى لَيْلٍ، وَذَلِكَ قَبْلَ أَنْ

نتخذ الكُنُف قريبا من بيوتنا، وامرنا امر العرب الأول في البرّية او في التنزّه، فاقبلتْ انا وأمُّ مسطح بنتُ ابي رُهم نمشي، فعثرتْ في مرطها فقالتْ تعس مسطحٌ، فقلتُ لها بئس ما قلت، اتسبّين رجلاً شهد بدرًا فقالتْ يا هنتاه الم تسمعي ما قالوا فاخبرتني بقول اهل الإفك، فازددتُ مرضا الى مرضي، فلمّا رجعتُ الى بيتي دخل عليّ رسولُ الله ﷺ فسلّم فقال ( كيف تيكمْ ( . فقلتُ ائذنْ لي الى ابوىّ. قالتْ وانا حينئذٍ أُريدُ انْ استيقن الخبر منْ قبلهما، فاذن لي رسولُ الله ﷺ فاتيتُ ابوىّ فقلتُ لأمّي ما يتحدّثُ به النّاسُ فقالتْ يا بُنيّةُ هوّني على نفسك الشّان، فوالله لقلما كانت امرأةٌ قطُّ وضيئةٌ عند رجلٍ يُحبُّها ولها ضرائرُ الاّ اكثرْن عليها. ( فقلتُ سبحان الله ) ولقدْ يتحدّثُ النّاسُ بهذا قالتْ فبتُّ تلك اللّيلة حتّى اصبحتُ لا يرقأُ لي دمعٌ ولا اكتحلُ بنومٍ، ثمّ اصبحتُ فدعا رسولُ الله ﷺ عليّ بن ابي طالبٍ وأُسامة بن زيدٍ حين استلبث الوحىُ، يستشيرُهما في فراق اهله، فامّا أُسامةُ فاشار عليه بالّذي يعلمُ في نفسه من الودّ لهمْ، فقال أُسامةُ اهلك يا رسول الله ولا نعلمُ والله الاّ خيرًا، وامّا عليُّ بنُ ابي طالبٍ فقال يا رسول الله لمْ يُضيّق اللهُ عليك والنّساءُ سواها كثيرٌ، وسل الجارية تصدُقْك. فدعا رسولُ الله ﷺ بريرة فقال ( يا بريرةُ هل رايت فيها شيئًا يريبُك ( . فقالتْ بريرةُ لا والّذي بعثك بالحقّ، انْ رايتُ منها امرًا اغمصُهُ عليها اكثر منْ انّها جاريةٌ حديثةُ السّنّ تنامُ عن العجين فتاتي الدّاجنُ فتاكُلُهُ. فقام رسولُ الله ﷺ منْ يومه، فاستعذر منْ عبد الله بن اُبىّ ابن سلول فقال رسولُ الله ﷺ ( منْ يعذرني منْ رجلٍ بلغني اذاهُ في اهلي، فوالله ما علمتُ على اهلي الاّ خيرًا، وقدْ ذكروا رجلاً ما علمتُ عليه الاّ خيرًا، وما كان يدخُلُ على اهلي الاّ معي ) . فقام سعدُ بنُ مُعاذٍ فقال يا رسول الله انا والله اعذرُك منهُ، انْ كان من الأوس ضربنا عُنُقهُ، وانْ كان منْ اخواننا من الخزرج امرتنا ففعلنا فيه امرك. فقام سعدُ بنُ عُبادة وهُو سيّدُ الخزرج، وكان قبل ذلك رجلاً صالحًا ولكن احتملتْهُ الحميّةُ فقال كذبت لعمرُ الله، لا تقتُلُهُ ولا تقدرُ على ذلك، فقام أُسيدُ بنُ الحُضير فقال كذبت لعمرُ الله، والله لنقتُلنّهُ، فانّك مُنافقٌ تُجادلُ عن المُنافقين. فثار الحيّان الأوسُ والخزرجُ حتّى همُّوا، ورسولُ الله ﷺ على المنبر فنزل فخفّضهمْ حتّى سكتُوا وسكت، وبكيتُ يومي لا يرقأُ لي دمعٌ ولا اكتحلُ بنومٍ، فاصبح عندي ابواى، و قدْ بكيتُ ليلتين ويومًا حتّى اظُنُّ انّ البُكاء فالقٌ كبدي. قالتْ . فبينا هُما جالسان عندي وانا ابكي اذ استاذنتْ امرأةٌ من الأنصار فاذنتُ لها، فجلستْ

تَبكِي مَعِي، فَبَيْنَا نَحْنُ كَذَلِكَ اِذْ دَخَلَ رَسُولُ اللَّه ﷺ فَجَلَس، وَلَمْ يَجْلِسْ عِنْدِي مِنْ يَوْمِ قِيلَ فِيَّ مَا قِيلَ قَبْلَهَا، وَقَدْ مَكَثَ شَهْرًا لاَ يُوحَى اِلَيْه فِي شَأنِي شَيْءٌ قَالَتْ ـ فَتَشَهَّدَ ثُمَّ قَالَ ( يَا عَائِشَةُ فَاِنَّهُ بَلَغَنِي عَنك كَذَا وَكَذَا، فَاِنْ كُنْت بَرِيئَةً فَسَيُبَرِّئُك اللَّهُ، وَاِنْ كُنْتِ اَلْمَمْتِ بِذَنْبٍ فَاسْتَغْفِرِي اللَّهَ وَتُوبِي اِلَيْه، فَاِنَّ الْعَبْدَ اِذَا اعْتَرَفَ بِذَنْبِه ثُمَّ تَابَ تَابَ اللَّهُ عَلَيْه ). فَلَمَّا قَضَى رَسُولُ اللَّه ﷺ مَقَالَتَهُ قَلَص دَمْعِي حَتَّى مَا اُحِسُّ مِنْهُ قَطْرَةً وَقُلْتُ لأَبِي اَجِبْ عَنِّي رَسُولَ اللَّه ﷺ. قَالَ وَاللَّه مَا اَدْرِي مَا اَقُولُ لِرَسُولِ اللَّه ﷺ. فَقُلْتُ لأُمِّي اَجِيبِي عَنِّي رَسُولَ اللَّه ﷺ فِيمَا قَالَ. قَالَتْ وَاللَّه مَا اَدْرِي مَا اَقُولُ لِرَسُولِ اللَّه صلى الله عليه وسلم. قَالَتْ وَاَنَا جَارِيَةٌ حَدِيثَةُ السِّنِّ لاَ اَقْرَاُ كَثِيرًا مِنَ الْقُرْاٰنِ فَقُلْتُ اِنِّي وَاللَّه لَقَدْ عَلِمْتُ اَنَّكُمْ سَمِعْتُمْ مَا يَتَحَدَّثُ بِه النَّاسُ، وَوَقَرَ فِي اَنْفُسِكُمْ وَصَدَّقْتُمْ بِه، وَلَئِنْ قُلْتُ لَكُمْ اِنِّي بَرِيئَةٌ. وَاللَّهُ يَعْلَمُ اِنِّي لَبَرِيئَةٌ لاَ تُصَدِّقُونِي بِذَلِك، وَلَئِنِ اعْتَرَفْتُ لَكُمْ بِاَمْرٍ، وَاللَّهُ يَعْلَمُ اَنِّي بَرِيئَةٌ لَتُصَدِّقُنِّي وَاللَّه مَا اَجِدُ لِي وَلَكُمْ مَثَلاً اِلاَّ اَبَا يُوسُفَ اِذْ قَالَ فَصَبْرٌ جَمِيلٌ وَاللَّهُ الْمُسْتَعَانُ عَلَى مَا تَصِفُونَ ثُمَّ تَحَوَّلْتُ عَلَى فِرَاشِي، وَاَنَا اَرْجُو اَنْ يُبَرِّئَنِي اللَّهُ، وَلَكِنْ وَاللَّه مَا ظَنَنْتُ اَنْ يُنْزِلَ فِي شَأنِي وَحْيًا، وَلاَنَا اَحْقَرُ فِي نَفْسِي مِنْ اَنْ يُتَكَلَّمَ بِالْقُرْاٰنِ فِي اَمْرِي، وَلَكِنِّي كُنْتُ اَرْجُو اَنْ يَرَى رَسُولُ اللَّه ﷺ فِي النَّوْمِ رُؤْيَا يُبَرِّئُنِي اللَّهُ، فَوَاللَّه مَا رَامَ مَجْلِسَهُ وَلاَ خَرَجَ اَحَدٌ مِنْ اَهْلِ الْبَيْتِ حَتَّى اُنْزِلَ عَلَيْه، فَاَخَذَهُ مَا كَانَ يَاْخُذُهُ مِنَ الْبُرَحَاءِ، حَتَّى اِنَّهُ لَيَتَحَدَّرُ مِنْهُ مِثْلُ الْجُمَانِ مِنَ الْعَرَقِ فِي يَوْمٍ شَاتٍ، فَلَمَّا سُرِّيَ عَنْ رَسُولِ اللَّه ﷺ وَهُوَ يَضْحَكُ، فَكَانَ اَوَّلَ كَلِمَةٍ تَكَلَّمَ بِهَا اَنْ قَالَ لِي ( يَا عَائِشَةُ، احْمَدِي اللَّهَ فَقَدْ بَرَّاَكِ اللَّهُ ). فَقَالَتْ لِي اُمِّي قُومِي اِلَى رَسُولِ اللَّه ﷺ. فَقُلْتُ لاَ وَاللَّه، لاَ اَقُومُ اِلَيْه، وَلاَ اَحْمَدُ اِلاَّ اللَّهَ فَاَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (اِنَّ الَّذِينَ جَاءُوا بِالاِفْكِ عُصْبَةٌ مِنْكُمْ ) الآيَات. فَلَمَّا اَنْزَلَ اللَّهُ هَذَا فِي بَرَاءَتِي قَالَ اَبُو بَكْرٍ الصِّدِّيقُ ـ رضى الله عنه ـ وَكَانَ يُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحِ بْنِ اُثَاثَةَ لِقَرَابَتِه مِنْهُ وَاللَّه لاَ اُنْفِقُ عَلَى مِسْطَحٍ شَيْئًا اَبَدًا بَعْدَ مَا قَالَ لِعَائِشَةَ. فَاَنْزَلَ اللَّهُ تَعَالَى (وَلاَ يَاْتَلِ اُولُو الْفَضْلِ مِنْكُمْ وَالسَّعَةِ ) اِلَى قَوْلِه ( غَفُورٌ رَحِيمٌ ) فَقَالَ اَبُو بَكْرٍ بَلَى، وَاللَّه اِنِّي لأُحِبُّ اَنْ يَغْفِرَ اللَّهُ لِي، فَرَجَعَ اِلَى مِسْطَحٍ الَّذِي كَانَ يُجْرِي عَلَيْه. وَكَانَ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم يَسْاَلُ زَيْنَبَ بِنْتَ جَحْشٍ عَنْ اَمْرِي، فَقَالَ ( يَا زَيْنَبُ، مَا عَلِمْتِ مَا رَاَيْتِ ( . فَقَالَتْ يَا رَسُولَ اللَّه، اَحْمِي سَمْعِي وَبَصَرِي، وَاللَّه مَا عَلِمْتُ عَلَيْهَا اِلاَّ خَيْرًا، قَالَتْ وَهْىَ الَّتِي كَانَتْ تُسَامِينِي، فَعَصَمَهَا اللَّهُ بِالْوَرَعِ. ( البخاري/ ٢٦٦١ )

دایكمان عائیشه (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:
(پێغەمبەری (ﷺ) عادەتی وا بوو هەر كە بیویستایه له ماڵ دەربچێ ، قورعەی له نێوان هاوسەرەكانیدا دەكرد ، جا سەهمی هەركامیان دەرچوایه پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەگەڵ خۆیدا دەیبرد .. ئەوەبوو له یەكێك له غەزاكاندا قورعەی بۆ كردین و ، سەهمی من دەرچوو ، لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) دەرچووم ئەمەش پاش ئەوەی فەرمان به پۆشتەیی ئافرەتان درا بوو .. منیش له كەژاوەكەم دا سوار دەكرام و دادەبەزێنرام ، ئەوە بوو ڕۆیشتین تا پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەو غەزایەی لێ بوەوە و گەڕایەوە .
كه له گەڕانەوەمان دا له مەدینه نزیك كەوتینەوە ، شەوێك فەرمانی دا بكەوینه ڕێ ، كه فەرمانی كەوتنه ڕێ درا ، هەستام ڕۆیشتم تا له سوپاكه تێپەڕم كرد ، كه كارم تەواو بوو هاتمەوە بۆ لای بارخانەكەم هەستم كرد ملوانكەكەم كه له بەردی (أظفار) دروست كرابوو بچڕاوە منیش بۆی گەڕام ، بەو گەڕانەشم درەنگ كەوتم ، جا ئەوانەی كه كەژاوەكەی منیان له ووشترەكه دەنا هاتن و كەژاوەكەمیان هەڵگرت و ، نایانه سەر ئەو ووشترەی كه سواری دەبووم ، وایان دەزانی له ناویدام ، ئەو دەمه ژنان كێشیان سووك بوو ، گۆشتیان نەگرتبوو قورس نەبوو بوون ، چونكه خواردنی كەمیان دەخوارد ، لەبەر ئەوە سووكیی كەژاوەكه ، به لای پیاوەكانەوە سەیر نەبوو كاتێ كه بەرزیان كردبووەوە منیش كچۆڵەیەكی منداڵ بووم ، ووشترەكەیان هەڵساند و كەوتنه ڕێ ، دوای ئەوەی كه سووپا كەوته ڕێ منیش ملوانكەكەم دۆزییەوە و هاتمەوە بۆ جێگاكەیان ، كەسی لێ نەما بوو ، ڕووم لەو جێ یه نا كه لێ ی بووم ، پێم وابوو دەزانن بەجێ ماوم و به دواما دەگەڕێنەوە . جا كاتێ لەو شوێنەم دا دانیشتبووم خەو زۆری بۆ هێنام و خەوتم.
ئەوە بوو صەفوانی كوڕی موعەططه لی سولەمیی زەكوانیی له دوای لەشكرەكەوە بوو له ئاخری شەودا كەوتبوە ڕێ ، تا له لای جێگەكەی من دا ڕۆژی لێ بوو بوەوە ، تارمایی مرۆڤێكی خەوتووی بەدیی كردبوو ، بەرەو ڕووم هات ، كه بینیمی ناسیمی ، چونكه پێش هاتنی ئایەتی حیجاب چاوی پێم دەكەوت ، كه ناسیمی به (إنا لله و إنا إليه راجعون) ی ئەو بەخەبەرهاتم ، خێرا به بەرگەكەم دەم و چاوم داپۆشی ، دەبەخوا نه ئەو ووشەیەك قسەی لەگەڵدا كردم و ، نه منیش . ئەوەبوو ووشترەكەی یەخ داو دوو دەستی ووشترەكەی نەوی كرد و منیش سواری

ووشتره‌كه بووم . جڵه‌وی ووشتره‌كه‌ی ڕاكێشاو كه‌وته ڕێ هه‌تا گه‌یشتینه لای سوپا دوای ئه‌وه‌ی له كاتی گه‌رمای نیوه‌ڕۆدا باریان لێ خستبوو ، ئیتر ئه‌وه بوو ئه‌وه‌ی كه تیاچوو تیاچوو ، عه‌بدوللای كوڕی ئوبه‌ی كوڕی سه‌لولیش بوو كه كاری سه‌ره‌كیی و گرنگی ئه‌و بوختانه‌ی ئه‌نجام دا و گه‌وره‌ی كرد.

هاتینه‌وه مه‌دینه كه گه‌یشتمه‌وه ماڵ مانگێك نه‌خۆش كه‌وتم و ، و خه‌ڵكیش ووته‌ی ئه‌هلی ئیفكیان دووباره ده‌كرده‌وه و ، منیش هه‌ستم به هیچێ له‌وه نه‌ده‌كردوو ، ئه‌وه‌ش كه منی ده‌خسته گومانه‌وه له نه‌خۆشیه‌كه‌مدا ئه‌وه بوو ئه‌و لوتفه‌م به پێغه‌مبه‌ری خواوه (ﷺ) نه ئه‌دیی ، كه جاران كاتێ نه‌خۆش بوومایه ئه‌م دی ، هه‌ر ئه‌وه‌نده پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌هاته ژووره‌وه لام و سه‌لامی ده‌كرد و پاشان ده‌یفه‌رموو نه‌خۆشه‌كه‌تان چۆنه؟ ئاگام له‌و بوختانه نه‌بوو هه‌ستم پێ نه‌ده‌كرد تا كه‌مێ چاك بوومه‌وه ، ده‌رچووم له‌گه‌ڵ ئوم میسطه‌ح بۆ (مناصع) جی ی ده‌ست به‌ئاو گه‌یاندنمان ، كه ته‌نها به شه‌و بۆی ده‌چووین . ئه‌مه‌ش پێش ئه‌وه‌ی له ماڵه‌كانمان دا ئاو ده‌ست دروست بكه‌ین . هه‌روه‌ك عه‌ره‌بی پێشوو وا بووین و له‌وه بێزار بووین كه له لای ماڵه‌كانمان دا ئاوده‌ست دروست بكه‌ین .

من و ئوم میسطه‌ح ڕوومان له ماڵه‌وه ناو ، ئوم میسطه‌ح پێ ی له به‌رگه‌كه‌ی هه‌ڵه‌نگوت كه له به‌ریا بوو ووتی : ده‌ك ملی میسطه‌ح بشكێ . منیش پێم ووت : شتێكی خراپت ووت . ئایا جنێو به پیاوێك ده‌ده‌ی كه ئاماده‌ی به‌در بووبێ ؟

ووتی ئه‌ی فلانه ! بۆ نه‌ت بیستووه ئه‌و چیی ووتوه ؟ ئه‌وه‌بوو ده‌نگ و باسی ئه‌هلی ئیفكی بۆ گێڕامه‌وه و ، ئه‌وه‌نده‌ی تر نه‌خۆشیه‌كه‌م زیادی كرد.

كه گه‌ڕامه‌وه ماڵه‌وه پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ته‌شریفی هاته لام و سه‌لامی كرد و پاشان فه‌رمووی : نه‌خۆشه‌كه‌تان چۆنه ؟ منیش ووتم ئیزنم ئه‌ده‌ی سه‌ر له دایك و باوكم بده‌م ؟ ده‌ڵێت ئه‌و كاته ده‌م ویست لای ئه‌وان ته‌حقیقی هه‌واڵه‌كه بكه‌م ، ئه‌ڵێت : پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئیزنی دام و هاتمه لایان و به دایكم ووت: دایه گیان خه‌ڵكی باسی چی ده‌كه‌ن ؟ ووتی كچی خۆم ! دان به خۆت دا بگره . ده به‌خوا كه‌م وا بووه ژنێكی جوان لای پیاوێك بێت خۆشی بوێ و هه‌وێی هه‌بن ، قسه‌ی زۆری له باره‌وه نه‌كه‌ن .

ووتم: سبحان الله ! ئایا خەڵكی باس لە شتی وا دەكەن ؟ دەفەرموێت: ئەو شەوە هەتا بەیانی هەر گریام بێ ئەوەی فرمێسكی چاوم ووشك ببنەوە، و بێ ئەوەش خەو بچێتە چاوم ، هەتا ڕۆژم لێ بوەوە .

ئەوە بوو پێغەمبەری خوا (ﷺ) كاتێك كە وەحیی وەستا بوو بانگی كردە عەلی كوڕی ئەبو طالیب و زەیدی كوڕی حاریثە (خوایان لێ ڕازی بێت) تا لە بارەی جیا بوونەوە لەگەڵ هاوسەرەكەیدا ڕاوێژیان پێ بكات ، جا ئوسامە چی لە بارەی پاكیی هاوسەریەوە دەیزانیی و چی ڕێز و خۆشەویستی لە دڵیا بەرامبەری هەیبوو بۆ پێغەمبەری (ﷺ) ڕوون كردەوە و ووتی ، جگە لە چاكە هیچ پێ نازانین ، بەڵام عەلی كوڕی ئەبو تاڵیب ووتی : ئەی پێغەمبەری خوا ! خوا ژنی لێ قات نەكردووی ، غەیری ئەو ژن زۆرن و ، گەر لە جاریەكەشی پرسیار بكەیت ڕاستیت پێ دەڵێ.

پێغەمبەری خواش (ﷺ) بەریرەی بانگ كرد و فەرمووی : ئەی بەریرە! ئایا تۆ هیچت بە عائیشەوە دیوەكە بكەویتە گومانەوە لێ ی ؟ بەریرە ووتی : بەو خوایەی كە تۆی بە حەق ناردووە ، جگە لەوەی كە كچێكی مناڵە و خەوی لێ ئەكەوێ و بزنی ناوماڵیش دێن هەویرەكەی دەخۆن ، هیچ شتێكم نەدیوە كە بە عەیب لێ ی بگرم . ئیتر پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەستاو سەركەوتە سەر مینبەر و داوای ئیزنی لە خەڵكەكە كرد بۆ سزادانی عەبدوڵلای كوڕی ئوبەی كوڕی سەلول.

فەرمووی: موسوڵمانان ! دەرحەق بە پیاوێ كە ئەزیەت و ئازاری بەرامبەر بە ئەهلی بەیتم پێ گەییوەتەوە كێ عوزرم بۆ دێنێتەوە ؟ دە بەخوا چاكە نەبێ هیچم بە هاوسەرمەوە نەدیوە و ، پیاوێكیشیان ناو بردوە چاكە نەبێ هیچم بەویشەوە نەدیوە ، لەگەڵ خۆیشم دا نەبێ نەهاتۆتە ماڵمەوە .

سەعدی كوڕی موعاذی ئەنصاری هەستاو ووتی: ئەی پێغەمبەری خوا من لە سەری عوزرت بۆ دێنمەوە ، جا ئەگەر لە ئەوس بوو ئەوا لە ملی دەدەم و ، گەر لە برایانی خەزرەجیشمان بوو ئەوا فەرمانمان پێ دەكەیت و فەرمانەكەت جێ بە جێ دەكەین ، خێرا سەعدی كوڕی عوبادە ، كە سەرداری خەزرەج بوو ، پێش ئەوە پیاوێكی صالح بوو ، بەڵام لەو كاتەدا دەمارگیری ڕووی تێكرد و هەستاو بە سەعدی ووت : سوێند بەخوا درۆت كرد ، نایكوژیت و ناشتوانی بیكوژی..

ئەوەبوو ئوسەیدی كوڕی حوضەیر، كە ئامۆزای سەعدی كوڕی موعاذ بوو هەستاو بە سەعدی كوڕی عوبادەی ووت : سوێند بەخوا درۆت كرد ، تۆ مونافیقی و بەرگری لە مونافیقانیش دەكەی ، ئەوس و خەزرەج هەردووكیان پەلاماری یەكتریان داو هەتا نیازی ئەوەشیان كرد كوشتاری یەكتر بكەن ، و پێغەمبەری خواش (ﷺ) لەسەر مینبەر وەستا بوو هەر خەریكی هێمن كردنەوەیان بوو ، هەتا بێ دەنگ بوون ، ئەویش بێ دەنگ بوو .

ئەو ڕۆژە هەروا مامەوە، نە فرمێسكم ووشك دەبونەوە ، نە خەویش دەچووە چاوم ، دایك و باوكیشم لە لام بوون، دوو شەوو ڕۆژێك هەر گریام بێ ئەوەی خەو بچێتە چاوم و فرمێسكم وشك ببنەوە ، هەتا پێم وابوو گریان جەرگم لەت دەكات ، جا لە كاتێكدا كە لە لام دانیشتبوون و منیش دەگریام ، ئافرەتێكی ئەنصاری ئیزنی وەرگرت بێتە ژوورەوە لام ، منیش ئیزنم دا .. دانیشت و لەگەڵما دەستی بەگریان كرد .

جا ئێمە لەم حاڵەتەدا بووین پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەشریفی هاتە ژوورەوە لامان و سەلامی كرد و پاشان دانیشت و ، و لەو كاتەوە كە ئەو قسە هەڵبەستراوە لە بارەی منەوە ووترابوو لە لام دانەنیشتبوو ، ئەوە بوو مانگێكی بەسەرداچوو لە بارەی منەوە وەحی بۆ نەدەهات .

كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) دانیشت شایەتمانی هێنا و پاشان فەرمووی :

(عائیشە ئەوە و ئەوەم لە بارەی تۆوە پێگەیشتووە ، جا ئەگەر تۆ پاك و بەریی بیت ئەوا خوا بە پاكت دەردەكات ، خۆ ئەگەر گوناهێكیشت لە دەست دەرچووە ، ئەوا داوای لێ خۆشبوون لە خوا بكە و تەوبە بكە ، چونكە ئەگەر بەندە دانی بە تاوانی خۆیدا ناو پاشان تەوبەی كرد ، ئەوا خوا تەوبەی لێ وەردەگرێت.

كە پێغەمبەری خوا (ﷺ) فەرمایشتەكەی تەواو كرد فرمێسكم نیشتەوە ، بە ڕادەیەك هەستم بە دڵۆپێكیش نەدەكرد ، جا بە باوكمم ووت : لە بارەی ئەوەوە كە فەرمووی لە جیاتی من وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە : ووتی دە بەخوا نازانم چی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێم ، ئینجا بە دایكمم ووت : وەڵامی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بدەرەوە ووتی نازانم چی بە پێغەمبەری خوا (ﷺ) بڵێم ، منیش ئەو كاتە كچێكی منداڵ بووم و قورئانی زۆرم لەبەر نەبوو ، ووتم : بەخوا من زانیومە كە ئەو باسەتان بیستووە و چۆتە ناو دڵتانەوە و باوەڕتان پێ كردووە ئەگەر پێتان

بلێم كه من بێتاوانم (كه خوا چاك ئه‌زانێ بێتاوانم) ئه‌وا به‌وه بڕوام پیّ ناكه‌ن ، به‌لاّم گه‌ر دان به كارێكدا بنێم (كه خوا چاك ده‌زانێ من لێ ی به‌ریم) ، ئه‌وا بڕوام پیّ ئه‌كه‌ن .

ده به‌خوا بۆ ئه‌مه هیچتان بۆ شك نابه‌م جگه له فه‌رمایشته‌كه‌ی باوكی یوسف كه فه‌رمووی : ((فصبر جمیل والله المستعان علی ماتصفون)) . یوسف/١٨

پاشان پشتم تیّ كردن و له‌سه‌ر نوێنه‌كه‌م ڕاكشام ، ئومێدیشم هه‌بوو به‌خوای گه‌وره كه پاكێتی و به‌رانه‌تم ده‌ربخات ، به‌لاّم سوێند به‌خوا پێم وانه‌بوو وه‌حیی له باره‌ی منه‌وه دابه‌زێت و خۆم له‌وه به كه‌متر ده‌زانی قورئان بخوێنرێت باس و خواسی منی تیا بێت به‌لاّم من به ته‌مای ئه‌وه بووم پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) خه‌ونێك ببینێ و به‌وه خوای گه‌وره من ته‌برییه بكات سوێند به‌خوا هێشتا پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ئه‌و شوێنه‌ی به‌جیّ نه‌هێشتبوو یه‌ك كه‌سیش له ئه‌هلی ماڵه‌كه نه‌چووبونه ده‌ره‌وه ، وه‌حیی دابه‌زی به سه‌ری و ئه‌و توندی یه‌ی تووش هات كه له كاتی وه‌حیی دا تووشی ده‌هات ، كه له ڕۆژی زستان دا به وێنه‌ی دوڕ عه‌ره‌قی لێ ده‌چۆڕی ، جا كه ئه‌و حاڵه‌ته‌ی له‌سه‌ر لاچوو پێكه‌نیی . یه‌كه‌م ووشه‌یه‌كیش كه فه‌رمووی ئه‌مه بوو ((ئه‌ی عایشه سوپاسی خوا بكه ، چونكه خوا ته‌برییه‌ی كردیت))

دایكم ووتی (هه‌سته بچۆره خزمه‌تی) . ووتم (به‌خوا ناچمه خزمه‌تی) و جگه له‌خوا سوپاسی كه‌سی تر ناكه‌م ، ئه‌وه بوو خوای گه‌وره ئه‌م ئایه‌تانه‌ی نارده خواره‌وه ((إن الذین جاؤا بالأفك عصبة منكم)) تا ئایه‌تی ((و أن الله رؤوف رحیم)) سوره‌تی النور (١١–٢٠)

كاتێكیش خوای گه‌وره ئه‌مه‌ی بۆ بیّ تاوانی من نارده خواره‌وه، ئه‌بوو به‌كری صدیق . كه پیشتر پاره‌ی ده‌به‌خشی به میسطه‌ح كوڕی ئه‌ثاثه به بۆنه‌ی خزمایه‌تی و هه‌ژاری یه‌وه . ووتی : ده‌به‌خوا ئیتر هه‌رگیز هیچ نابه‌خشم به میسطه‌ح دوای ئه‌و قسه‌یه‌ی به عائیشه‌ی ووتوه .

ئه‌وه بوو خوای گه‌وره‌ش ئایه‌تی (٢٢) ی سوره‌تی (النور) ی نارده خوار ((و لا یأتل أولوا الفضل منكم .... تا والله غفور رحیم )) . خێرا ئه‌بوو به‌كریش وه‌لاّمی پرسیاره‌كه‌ی قورئانی دایه‌وه و فه‌رمووی (به‌ڵیّ به‌خوا پێم خۆشه خوا ی گه‌وره لێم خۆش بێت) . ئیتر وه‌ك جاران پاره‌ی بۆ میسطه‌ح خه‌رج ده‌كردو و فه‌رمووی : به‌خوا هه‌رگیز لێ ی ناگرمه‌وه .

حه‌زره‌تی عائیشه ده‌فه‌رموێت:

ئه‌وه بوو پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) له باره‌ی منه‌وه پرسیاری له زه‌ینه‌بی كچی جه‌حش كردبوو ، فه‌رمووبووی چی ده‌زانیت ، یان چیت دیوه ؟ زه‌ینه‌بیش فه‌رمووبووی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! چاوو گوێ ی خۆم ده‌پارێزم ، جگه له چاكه هیچ نازانم . عائیشه ده‌فه‌رموێت : له‌ناو هاوسه‌رانی پێغه‌مبه‌ری خوادا (ﷺ) ته‌نها ئه‌و له‌به‌ر جوانیی و رێزی به‌رامبه‌ر كێ ی له‌گه‌ڵ ده‌كردم ، ئه‌وه بوو به بۆنه‌ی وه‌رع و ته‌قوایه‌وه خوای گه‌وره پاراستی..

## چیرۆكی حه‌ڤده‌هه‌م

## چیرۆكی نوشته كردن به سوره‌تی فاتیحه

**عَنْ أَبِي سَعِيدٍ ( رضى الله عنه ) قَالَ انْطَلَقَ نَفَرٌ مِنْ أَصْحَابِ النَّبِيِّ ﷺ فِي سَفْرَةٍ سَافَرُوهَا حَتَّى نَزَلُوا عَلَى حَيٍّ مِنْ أَحْيَاءِ الْعَرَبِ فَاسْتَضَافُوهُمْ، فَأَبَوْا أَنْ يُضَيِّفُوهُمْ، فَلُدِغَ سَيِّدُ ذَلِكَ الْحَيِّ، فَسَعَوْا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لاَ يَنْفَعُهُ شَيْءٌ، فَقَالَ بَعْضُهُمْ لَوْ أَتَيْتُمْ هَؤُلاَءِ الرَّهْطَ الَّذِينَ نَزَلُوا لَعَلَّهُ أَنْ يَكُونَ عِنْدَ بَعْضِهِمْ شَيْءٌ، فَأَتَوْهُمْ، فَقَالُوا يَا أَيُّهَا الرَّهْطُ، إِنَّ سَيِّدَنَا لُدِغَ، وَسَعَيْنَا لَهُ بِكُلِّ شَيْءٍ لاَ يَنْفَعُهُ، فَهَلْ عِنْدَ أَحَدٍ مِنْكُمْ مِنْ شَيْءٍ فَقَالَ بَعْضُهُمْ نَعَمْ وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْقِي، وَلَكِنْ وَاللَّهِ لَقَدِ اسْتَضَفْنَاكُمْ فَلَمْ تُضَيِّفُونَا، فَمَا أَنَا بِرَاقٍ لَكُمْ حَتَّى تَجْعَلُوا لَنَا جُعْلاً. فَصَالَحُوهُمْ عَلَى قَطِيعٍ مِنَ الْغَنَمِ، فَانْطَلَقَ يَتْفِلُ عَلَيْهِ وَيَقْرَأُ ( الْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ) فَكَأَنَّمَا نُشِطَ مِنْ عِقَالٍ، فَانْطَلَقَ يَمْشِي وَمَا بِهِ قَلَبَةٌ، قَالَ فَأَوْفَوْهُمْ جُعْلَهُمُ الَّذِي صَالَحُوهُمْ عَلَيْهِ، فَقَالَ بَعْضُهُمُ اقْسِمُوا. فَقَالَ الَّذِي رَقَى لاَ تَفْعَلُوا، حَتَّى نَأْتِيَ النَّبِيَّ ﷺ فَنَذْكُرَ لَهُ الَّذِي كَانَ، فَنَنْظُرَ مَا يَأْمُرُنَا. فَقَدِمُوا عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَذَكَرُوا لَهُ، فَقَالَ ( وَمَا يُدْرِيكَ أَنَّهَا رُقْيَةٌ ) ثُمَّ قَالَ ( قَدْ أَصَبْتُمُ اقْسِمُوا وَاضْرِبُوا لِي مَعَكُمْ سَهْمًا ) فَضَحِكَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ. وَقَالَ أبو عبدالله و قَالَ شُعْبَةُ : حَدَّثَنَا أَبُو بِشْرٍ سَمِعْتُ أَبَا الْمُتَوَكِّلِ بِهَذَا. ( البخاري/ ٢٢٧٦ )**

ئەبو سەعید (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

كۆمەڵێك لە هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) ڕۆیشتن بۆ گەشتێك ، لای ئاوایی یەك لە ئاواییەكانی عەرەب دابەزین و داوایان لێ كردن میوانداریان لێ بكەن ، ئەوانیش ملیان نەدا و میوانداری یان لێ نەكردن ، لەو كاتەدا گەورەكەیان مارێك (یان شتێكی تر) پێوەی دا ، هەرچی هەوڵێكیان لەگەڵ دا سوودی نەبوو چاك نەبوەوە ، ووتیان : بچن بۆ لای ئەوانە لەوێدا دابەزیون بەڵكو شتێكیان لا بێت . هاتن بۆ لایان و ووتیان : جەماعەت، ئێمە گەورەكەمان مار پێوەی داوە ، هەموو شتێكمان لەگەڵ دا بەكارهێنا سودی بۆی نەبوو ئایا كەس لە ئێوە شتێكی لا نیە ؟ یەكێكیان ووتی بەڕێ وەڵا من نوشتە دەكەم . بەڵام سوێند بەخوا ئێمە داوامان لێ كردن میوانداریمان لێ بكەن ئێوە میوانداریتان لێ نەكردین ، منیش نووشتەتان بۆ ناكەم تا بڕیار نەدەن شتێكمان بدەنێ سەرئەنجام لەسەر چەند سەر مەڕێك ڕێ كەوتن . دەست بەجێ ئەو هاوەڵە چوو دەستی كرد بە خوێندنی سوڕەتی (الحمدلله رب العالمین) و فوی كرد بەسەریا . كابرا وەك بڵێ ی بەند بێ و دەست و پێ ی بكەنەوە هەستاو دەستی كردە ڕۆیشتن .

پێ ی ووتن لەسەر چی ڕێ كەوتون بیان دەنێ . پاشان ووتیان دابەشی بكەن ، ئەوەی نوشتەكەی كرد بوو فەرموی : دەست كاری مەكەن تا دەچینە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) و ئەوەی ڕووی داوە بۆی دەگێڕینەوە بزانین چیمان پێ دەڵێت ؟ هاتنە خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و بۆیان باس كرد ، فەرمووی: ((جا تۆ چوزانیت سوڕەتی فاتیحە نوشتەیە؟)) پاشان فەرمووی : ((ئیشێكی چاكتان كردووە دابەشی بكەن و بەشێكیش بۆ من دابنێن لەگەڵ خۆتاندا)) پاشان پێغەمبەر دەستی كرد بە پێكەنین.

## چیرۆكی هەژدەهەم

## خێر و پلە و پایەی تێكۆشان لە ڕێ ی خوادا

**عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ـ رضى الله عنهما ـ أَنَّهُ قَالَ بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم بَعْثًا قِبَلَ السَّاحِلِ، فَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ أَبَا عُبَيْدَةَ بْنَ الْجَرَّاحِ وَهُمْ ثَلاَثُمِائَةٍ وَأَنَا فِيهِمْ، فَخَرَجْنَا حَتَّى إِذَا كُنَّا بِبَعْضِ الطَّرِيقِ فَنِيَ الزَّادُ، فَأَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِأَزْوَادِ ذَلِكَ الْجَيْشِ فَجُمِعَ ذَلِكَ كُلُّهُ فَكَانَ مِزْوَدَىْ تَمْرٍ،**

فَكَانَ يَقُوتُنَا كُلَّ يَوْمٍ قَلِيلاً قَلِيلاً، حَتَّى فَنِيَ فَلَمْ يَكُنْ يُصِيبُنَا إِلاَّ تَمْرَةً تَمْرَةً. فَقُلْتُ وَمَا تُغْنِي تَمْرَةٌ فَقَالَ لَقَدْ وَجَدْنَا فَقْدَهَا حِينَ فَنِيَتْ. قَالَ ثُمَّ انْتَهَيْنَا إِلَى الْبَحْرِ فَإِذَا حُوتٌ مِثْلُ الظَّرِبِ، فَأَكَلَ مِنْهُ ذَلِكَ الْجَيْشُ ثَمَانِيَ عَشْرَةَ لَيْلَةً، ثُمَّ أَمَرَ أَبُو عُبَيْدَةَ بِضِلَعَيْنِ مِنْ أَضْلاَعِهِ فَنُصِبَا، ثُمَّ أَمَرَ بِرَاحِلَةٍ فَرُحِلَتْ ثُمَّ مَرَّتْ تَحْتَهُمَا فَلَمْ تُصِبْهُمَا. (البخاري/ ٢٤٨٣)

جابری كوڕی عه‌بدوللا (خوایان لێ ڕازی بێت) ده‌فه‌رموێت:
پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) كۆمه‌ڵێك له هاوه‌ڵانی نارد به‌ره‌و كه‌ناری ده‌ریاو ئه‌بوو عوبه‌یده‌ی كوڕی جه‌ڕاحی كرده ئه‌میریان ، ئه‌وانیش سێ سه‌د كه‌س بوون من یه‌كێك بوم له‌وان ، ده‌رچووین تا له ڕێگایه‌كدا توێشوومان پێ نه‌ما ، ئه‌بوو عوبه‌یده (خوای لێ ڕازی بێت) فه‌رمانی دا هه‌موو خواردن و توێشووی سوپاكه كۆبكرێته‌وه ، دوو سه‌به‌ته خورما ده‌بوو .
به‌و جۆره ڕۆژانه كه‌م كه‌م به‌شی ده‌داین تا ته‌واو بوو له كۆتایی دا ده‌نك ده‌نك خورمای ده‌داینێ : منیش ووتم جا خورمایه‌ك به‌شی چی ده‌كات و بۆچی باشه؟ فه‌رمووی : تا خورماكه ته‌واو نه‌بوو قه‌درمان نه‌زانی . پاشان گه‌یشتینه ده‌ریا ده‌بینین نه‌هه‌نگێك له‌وێدایه ، ئه‌و سوپایه ماوه‌ی هه‌ژده شه‌و له‌و نه‌هه نگه‌ی خوارد .
پاشان ئه‌بوو عوبه‌یده فه‌رمانی دا دوو په‌راسووی بچه‌قێنن ، وه فه‌رمانی دا حوشترێك بار بكه‌ن ، پاشان حوشتره‌كه به ژێریاندا ڕۆیشت و به‌ر هیچیان نه‌كه‌وت (هێنده گه‌وره و به‌رز بوون).

## چیرۆكی نۆزده‌هه‌م

## دانه‌وه‌ی قه‌رزی شه‌هید

عَنْ جَابِرِ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ ( رضى الله عنهما ) قَالَ تُوُفِّيَ أَبِي وَعَلَيْهِ دَيْنٌ، فَعَرَضْتُ عَلَى غُرَمَائِهِ أَنْ يَأْخُذُوا التَّمْرَ بِمَا عَلَيْهِ، فَأَبَوْا وَلَمْ يَرَوْا أَنَّ فِيهِ وَفَاءً، فَأَتَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ، فَقَالَ ( إِذَا جَدَدْتَهُ فَوَضَعْتَهُ فِي الْمِرْبَدِ ) آذَنْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ فَجَاءَ وَمَعَهُ أَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ فَجَلَسَ عَلَيْهِ،

**ودعا بالبركة ثمَّ قالَ (ادْعُ غُرَمَاءكَ، فَأَوْفِهِمْ ) فَمَا تَرَكْتُ أَحَدًا لَهُ عَلَى أَبِي دَيْنٌ إِلاَّ قَضَيْتُهُ، وفضل ثَلاَثَةَ عَشَرَ وَسْقًا سَبْعَةً عَجْوَةً، وَسِتَّةً لَوْنٌ أَوْ سِتَّةً عَجْوَةً وَسَبْعَةً لَوْنٌ، فَوَافَيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ المَغْرِبَ فَذَكَرْتُ ذَلِكَ لَهُ فَضَحِكَ فَقَالَ ( ائْتِ أَبَا بَكْرٍ وَعُمَرَ فَأَخْبِرْهُمَا ) . فَقَالاَ لَقَدْ عَلِمْنَا إِذْ صَنَعَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ مَا صَنَعَ أَنْ سَيَكُونُ ذَلِكَ. وَقَالَ هِشَامٌ عَنْ وَهْبٍ عَنْ جَابِرٍ صَلاَةَ الْعَصْرِ. وَلَمْ يَذْكُرْ أَبَا بَكْرٍ وَلاَ ضَحِكَ، وَقَالَ وَتَرَكَ أَبِي عَلَيْهِ ثَلاَثِينَ وَسْقًا دَيْنًا. وَقَالَ ابْنُ إِسْحَاقَ عَنْ وَهْبٍ عَنْ جَابِرٍ صَلاَةَ الظُّهْرِ. (البخاري/ ٢٧٠٩ )**

جابرى كورِى عەبدوللا (خوايان لىٚ رِازى بێت) دەفەرمويٚت:

كاتىٚ باوكم وەفاتى كرد (شەهيد بوو) قەرزى لەسەر مابوو، منيش داوام لە خاوەن قەرزەكان كرد ، بە ئەندازەى قەرزەكەيان خورما ببەن ، ئەوانيش رِازى نەبوون وە ووتيان جىٚ ى ناگرێتەوە ، پاشان هاتمە خزمەتى پێغەمبەرى خوا (ﷺ) وە ئەوەم بۆ باس كرد ، فەرمووى : ((دەستێكيان پێدا بهێنە و رِێك و پێكيان بكەو لە (المربد) دايبنىٚ )) پاشان پێغەمبەرى خوا ئاگاداربكە .

ئەوە بوو پێغەمبەرى خوا (ﷺ) تەشريفى هێنا و ئەبو بەكر و عومەرى لەگەلٚ دا بوو لاى خورماكە دانيشت و دوعاى بەرەكەتى بەسەردا خوێند ، پاشان فەرمووى : ((خاوەن قەرزەكانت بانگ بكە و مافى خۆيان بدەرەوە بە تەواوى)) منيش قەرزەكانم دايەوە ، يەك كەس قەرزى لەسەر باوكم نەما و بگرە سيانزە ويسق خورما مايەوە ، حەوت عەجوە و شەش لە جۆرى تر يان شەش عەجوە و حەوت لە جۆرى تر .

پاشان نوێژى مەغريبم كرد لەگەلٚ پێغەمبەرى خوادا (ﷺ) و ئەوەشم بۆ باس كرد ، دەستى كردە پێكەنين و فەرمووى ((بچۆ بۆ لاى ئەبوبەكر و عومەر و هەوالٚى ئەوەيان بدەرىٚ ))

ئەوانيش فەرمويان : هەرزوو زانيمان كە پێغەمبەرى خوا (ﷺ) ئەو كارەى كرد ئەوەش روودەدات.

# چیرۆكی بیسته‌م

## ئه‌و ده‌سته‌ی ده‌به‌خشێت چاكتره له‌و ده‌سته‌ی وه‌رده‌گرێت

**عَنِ الزُّهْرِيِّ، عَنْ سَعِيدِ بْنِ الْمُسَيَّبِ، وَعُرْوَةَ بْنِ الزُّبَيْرِ ، أَنَّ حَكِيمَ بْنَ حِزَامٍ ( رضى الله عنه ) قَالَ سَأَلْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَأَعْطَانِي، ثُمَّ سَأَلْتُهُ فَأَعْطَانِي ثُمَّ قَالَ لِي ( يَا حَكِيمُ، إِنَّ هَذَا الْمَالَ خَضِرٌ حُلْوٌ، فَمَنْ أَخَذَهُ بِسَخَاوَةِ نَفْسٍ بُورِكَ لَهُ فِيهِ، وَمَنْ أَخَذَهُ بِإِشْرَافِ نَفْسٍ لَمْ يُبَارَكْ لَهُ فِيهِ، وَكَانَ كَالَّذِي يَأْكُلُ وَلاَ يَشْبَعُ، وَالْيَدُ الْعُلْيَا خَيْرٌ مِنَ الْيَدِ السُّفْلَى ). قَالَ حَكِيمٌ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، وَالَّذِي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لاَ أَرْزَأُ أَحَدًا بَعْدَكَ شَيْئًا حَتَّى أُفَارِقَ الدُّنْيَا. فَكَانَ أَبُو بَكْرٍ يَدْعُو حَكِيمًا لِيُعْطِيَهُ الْعَطَاءَ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَ مِنْهُ شَيْئًا، ثُمَّ إِنَّ عُمَرَ دَعَاهُ لِيُعْطِيَهُ فَيَأْبَى أَنْ يَقْبَلَهُ فَقَالَ يَا مَعْشَرَ الْمُسْلِمِينَ، إِنِّي أَعْرِضُ عَلَيْهِ حَقَّهُ الَّذِي قَسَمَ اللَّهُ لَهُ مِنْ هَذَا الْفَىْءِ فَيَأْبَى أَنْ يَأْخُذَهُ. فَلَمْ يَرْزَأْ حَكِيمٌ أَحَدًا مِنَ النَّاسِ بَعْدَ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم حَتَّى تُوُفِّيَ رَحِمَهُ اللَّهُ.( البخاري/ ٢٧٥٠ )**

حه‌كیمی كوڕی حیزام خوای لێ ڕازی بێت ده‌فه‌رموێت:

(( داوام كرد له پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) . ئه‌ویش پێ ی به‌خشیم پاشان داوام لێكرد پێ ی به‌خشیم ، پاشان فه‌رمووی پێم:((ئه‌ی حه‌كیم ئه‌م ماڵ و سامانه‌ی دونیا سه‌وز و شیرینه ، جا هه‌ركه‌س به‌ ده‌روونێكی به‌خشنده‌وه وه‌ری بگرێت به‌ره‌كه‌تدار ده‌بێت بۆی ، وه هه‌ركه‌س به‌ ته‌ماح و چاو هه‌ڵخستنه‌وه وه‌ری بگرێت به‌ره‌كه‌تدار نابێت بۆی ، وه وه‌كو ئه‌و كه‌سه ده‌بێت كه هه‌ر ده‌خوات و تێر نابێت ، ده‌ستی به‌خشنده‌ش چاكتره له ده‌ستی وه‌رگر ))

حه‌كیم فه‌رمووی : ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) سوێند به‌و كه‌سه‌ی تۆی به حه‌ق ڕه‌وانه كردووه. تا ئه‌م دونیایه به‌جێ دێڵم دوای تۆ داوا له كه‌س ناكه‌م بۆیه كه ئه‌بوبه‌كر (خوای لێ ڕازی بێت) داوای ده‌كرد كه حه‌كیم بێت و به‌شی خۆی وه‌رگرێت ، وه‌ری نه‌ده‌گرت ، پاشان عومه‌ر (خوای لێ ڕازی بێت) بانگی ده‌كرد به‌شی خۆی بداتێ ، وه‌ری نه‌ده‌گرت . فه‌رمووی : ئه‌ی كۆمه‌ڵی موسوڵمانان من مافی خۆی ده‌ده‌مێ كه خوای گه‌وره له‌م (بيت المال) ه به‌شی دیاری كردووه

كه‌چی وه‌ری ناگرێت . بۆیه حه‌كیم دوای پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) داوای هیچی له كه‌س نه‌ده‌كرد و له كه‌سی وه‌رنه‌ئه‌گرت تا وه‌فاتی كرد.

## چیرۆكی بیست و یه‌ك

## سووربوون له‌سه‌ر وه‌رگرتنی فه‌رمووده

**عنْ أبِـي هُرَيْـرَةَ ( رضـى الله عنـه ) قَـالَ يَقُولـُونَ انَّ أبَـا هُرَيْـرَةَ يُكْثِـرُ الحَـدِيثَ. وَاللَّـهُ المَوْعِـدُ، ويَقُولُونَ مَا لِلمُهَاجِرِينَ وَالانْصَارِ لاَ يُحدِّثُونَ مِثْلَ أحَادِيثِه وَانَّ إخْوَتِي مِنَ المُهَاجِرِينَ كَانَ يَشْغَلُهُمُ الصَّفْقُ بِالاسْوَاقِ، وَانَّ إخْوَتِي مِنَ الانْصَارِ كَـانَ يَشْغَلُهُمْ عَمَـلُ أمْـوَالِهِمْ، وَكُنْـتُ امْـرأً مِـسْكِينًا ألْـزَمُ رَسُولَ اللَّه ﷺ عَلَى مِلْءِ بَطْنِي، فَاحْضُرُ حِينَ يَغِيبُونَ وَاعِي حِـينَ يَنْـسَوْنَ، وَقَـالَ النَّبِـيُّ ﷺ يَوْمًـا ( لَنْ يَبْسُطَ احَدٌ مِنْكُمْ ثَوْبَهُ حَتَّى اقْضِيَ مَقَالَتِي هَذه ) ثُمَّ يَجْمَعَهُ الَـى صَدْرِه، فَيَنْـسَى مِـنْ مَقَـالَتِي شَيْئًا ابَدًا ( . فَبَسَطْتُ نَمِرَةً لَيسَ عَلَىَّ ثَوْبٌ غَيْرَهَا، حَتَّى قَضَى النَّبِيُّ ﷺ مَقَالَتَهُ، ثُمَّ جَمَعْتُهَا الَى صَدْرِي، فَوَالَّذِي بَعَثَهُ بِالحَقِّ مَا نَسِيتُ مِنْ مَقَالَتِه تِلْكَ الَى يَوْمِي هَذَا، وَاللَّه لَوْلاَ ايَتَـانِ فِـي كِتَـابِ اللَّه مَا حَـدَّثْتُكُمْ شَيْئًا ابَـدًا ( انَّ الَّـذِينَ يَكْتُمُـونَ مَـا انْزَلْنَـا مِـنَ البَيِّنَـاتِ و الهـدى ) الَـى قَوْلـه ( الرَّحِيمُ ) البقرة ١٥٩-١٦٠ ( البخاري/ ٢٣٥٠ )**

ئه‌بو هوره‌یره(خوای لێ ڕازی بێت) ده‌فه‌رموێت:

خه‌ڵكی ده‌ڵێن ( ئه‌بو هوره‌یره زۆر خه‌ریك ده‌بێت به‌گێڕانه‌وه‌ی فه‌رموده‌وه‌) ، هه‌موومان ده‌چینه‌وه به‌رده‌ستی خوای گه‌وره و ئه‌و مه‌وعید و كاتێكی دیاری كراوی بۆ داناوین بۆ لێپرسینه‌وه(واته‌ئه‌گه‌ر خوانه خواسته درۆبكه‌م به‌ده‌م پێغه‌مبه‌ره‌وه).یان ده‌ڵێن:باشه‌بۆ كۆچ كه‌ران و پشتیوانان ئه‌و فه‌رمودانه‌ی ئه‌و ریوایه‌ت ناكه‌ن؟ بیگومان برا كۆچ كه‌ره‌كانم به‌ده‌نگه ده‌نگی ناو بازاڕه‌كانه‌وه سه‌رقاڵ بوون،وه برا پشتیوانه‌كانم به‌كار و كاسبی و سه‌روه‌ته‌كانیانه‌وه سه‌رقاڵ بوون،منیش كابرایه‌كی هه‌ژار بووم هه‌میشه له‌خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوادا بووم (ﷺ) هه‌ر ئه‌وه‌نده‌ی سكم پڕبكردایه له‌خواردن كێشه‌م نه‌بوو.بۆیه كاتێ ئه‌وان له‌وێ نه‌بوون من ئاماده‌ده‌بووم،كاتێ ئه‌وان بیریان ده‌چووه‌من له‌به‌رم ده‌كرد.

رۆژێکیشیان پێغەمبەر(ﷺ)فەرمووی:

((لن يَبسُطَ أحدٌ منكم ثوبه حتى أقضيَ مقالتي هذه ثم يجمعه الى صدره فنيسى من مقالتي شيئاً أبداً)).

واتە:((هەرکەسێك لە ئێوە جل و بەرگەکەی بڵاو بکاتەوە و دوای ئەم ووتارەم کۆی بکاتەوە و باوەشی پیابکات، هەرگیز یەك شتی ئەم ووتارەی منی لەبیر ناچێتەوە))

جامن یەك پۆشاکم لەبەردابوو جگە لەوە هیچی ترم لەبەردانەبوو بڵاوم کردەوە تاپێغەمبەر(ﷺ)ووتارەکەی تەواو کرد پاشان کۆم کردەوە و نوساندم بە سنگمەوە، جا سوێند بەو کەسەی بە حەق و ڕاستی ئەوی ڕەوانەکردوە.هیچم لەو ووتارەی لەبیر نەچووە تائێستاو ئەم ڕۆژەی منی تیام.

وەسوێند بەخوا ئەگەر لەبەر دووئایەتی قورئان نەبوایە هەرگیز هیچم بۆ باس نەدەکردن و فەرمودەم بۆ نەدەگێڕانەوە. (إن الذين يكتمون ماأنزلنا...الرحيم) البقرە (١٥٩–١٦٠)

## چیرۆکی بیست و دوو

## ئایەتی کورسی و ترسی شەیتان لەو ئایەتە

**عَنْ اَبي هُرَيْرَةَ (رضی الله عنه) قَالَ وَكَّلَني رَسُولُ اللهِ ﷺ بحفظ زَكَاة رَمَضَانَ، فَاَتَاني ات فَجَعَلَ يَحْثو منَ الطَّعَام، فَاَخَذْتُهُ، وَقُلْتُ وَاللهِ لاَرْفَعَنَّكَ الَى رَسُول اللهِ ﷺ قَالَ انِّي مُحْتَاجٌ، وَعَلَيَّ عيَالٌ، وَلي حَاجَةٌ شَديدَةٌ. قَالَ فَخَلَّيْتُ عَنْهُ فَاَصْبَحْتُ فَقَالَ النَّبيُّ ﷺ (يَا اَبَا هُرَيْرَةَ مَا فَعَلَ اَسيرُكَ الْبَارِحَةَ). قَالَ قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ شَكَا حَاجَةً شَديدَةً وَعيَالاً فَرَحمْتُهُ، فَخَلَّيْتُ سَبيلَهُ. قَالَ (اَمَا انَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ). فَعَرَفْتُ اَنَّهُ سَيَعُودُ لقَوْل رَسُول اللهِ ﷺ انَّهُ سَيَعُودُ. فَرَصَدْتُهُ فَجَاءَ يَحْثو منَ الطَّعَام فَاَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لاَرْفَعَنَّكَ الَى رَسُول اللهِ ﷺ قَالَ دَعْني فَانِّي مُحْتَاجٌ، وَعَلَيَّ عيَالٌ لاَ اَعُودُ، فَرَحمْتُهُ، فَخَلَّيْتُ سَبيلَهُ فَاَصْبَحْتُ، فَقَالَ لي رَسُولُ اللهِ ﷺ (يَا اَبَا هُرَيْرَةَ، مَا فَعَلَ اَسيرُكَ). قُلْتُ يَا رَسُولَ اللهِ شَكَا حَاجَةً شَديدَةً وَعيَالاً، فَرَحمْتُهُ فَخَلَّيْتُ سَبيلَهُ. قَالَ (اَمَا انَّهُ قَدْ كَذَبَكَ وَسَيَعُودُ) فَرَصَدْتُهُ الثَّالثَةَ فَجَاءَ يَحْثو منَ الطَّعَام، فَاَخَذْتُهُ فَقُلْتُ لاَرْفَعَنَّكَ الَى رَسُول**

**اللَّه ﷺ ، وهذا اخرُ ثلاثِ مَراتٍ انَّكَ تَزْعَمُ لا تَعُودُ ثُمَّ تَعُودُ. قَـالَ دَعني أُعلِّمْكَ كلمـاتٍ ينفعُكَ اللّهُ بِهَا. قُلْتُ مَا هُوَ قَالَ اذا اوَيْتَ الى فِرَاشِكَ فَاقْرَأْ ( ايةَ الكُرْسِيّ)** {اللَّهُ لا إلهَ إلاّ هُوَ الحيُّ القَيُّومُ} **حتَّى تَخْتِمَ الايَةَ، فَانَّكَ لَنْ يَزَالَ عَلَيكَ مِنَ اللَّه حَافِظٌ ولاَ يَقرَبَنَّكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصبِحَ. فَخَلَيْتُ سَبِيلَهُ فَاصْبَحْتُ، فَقَالَ لي رَسُولُ اللَّه ﷺ ( مَا فعلَ اسيرُكَ البَارِحةَ ) . قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّه زَعمَ انَّهُ يُعَلِّمُني كَلِمَاتٍ، يَنْفَعُني اللّهُ بِهَا، فَخَلَّيْتُ سَبِيلَهُ. قَـالَ ( مَـا هِـيَ ( . قُلْتُ قَـالَ لـي اذا اوَيْتَ الى فِراشِكَ فَاقْرَأْ ايةَ الكُرْسِيّ مِنْ اوَّلِهَا حتَّى تَخْتِمَ** {اللّهُ لا إلهَ إلاّ هُوَ الحيُّ القَيُّومُ} **وقَالَ لي لَنْ يَزالَ عَلَيْكَ مِنَ اللَّه حَافِظٌ ولاَ يَقْرَبكَ شَيْطَانٌ حَتَّى تُصْبِحَ، وَكَانُوا احْرَصَ شيْءٍ عَلَى الخَيْرِ. فَقَالَ النَّبيُّ صلى الله عليه وسلم ( امَا انَّهُ قَدْ صَدَقَكَ وَهُوَ كَذُوبٌ، تَعْلَمُ مَنْ تُخَاطِبُ مُنْذُ ثَلاثِ لَيَالٍ يَا ابَا هُرَيْرَةَ ). قَالَ لاَ. قَالَ ( ذاكَ شَيْطَانٌ ).( البخاري )**

ئه‌بو هوره‌یره‌(خوای لیّ ڕازی بیّت) ده‌فه‌رمویّت:

پیّغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) كردمیه‌ بریكاری پاریّزگاریی زه‌كاتی مانگی ڕه‌مه‌زان،شه‌ویّك یه‌كیّك هات و هه‌ندیّ خۆراكی جیاكرده‌وه‌ بیدزیّت،منیش گرتم و ووتم:سویّند به‌خوا به‌رزت ده‌كه‌مه‌وه‌ بۆ لای پیّغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ).

ووتی:من ده‌ستم كورته‌ و مالّ و مندالّم هه‌یه‌ و موحتاجم. ده‌فه‌رمویّت: منیش به‌ڕه‌لاّم كرد،بۆبه‌یانی یه‌كه‌ی پیّغه‌مبه‌ر(ﷺ)فه‌رمووی:(ئه‌ی ئه‌بو هوره‌یره‌ دویّنیّ شه‌و دیله‌كه‌ت چی لیّ هات؟)ده‌لّیّ وتم ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا شه‌كوای حالّی خۆی كرد كه‌موحتاجه‌ و مالّ و مندالّی هه‌یه‌،منیش به‌زه‌ییم پیّیدا هاته‌وه‌ و به‌ڕه‌لاّم كرد،فه‌رمووی:((دلّنیا به‌ ئه‌و درۆی له‌گه‌لّدا كردیت و ده‌شگه‌ڕیّته‌وه‌)) منیش دوای فه‌رمووده‌كه‌ی پیّغه‌مبه‌ر(ﷺ)دلّنیا بووم ده‌گه‌ڕیّته‌وه‌.بۆیه‌ خۆم مه‌لاّس دا بۆی ئه‌وه‌بوو هات و هه‌ندیّ خۆراكی جیاكرده‌وه‌ بیدزیّ.منیش گرتم و ووتم: به‌رزت ده‌كه‌مه‌وه‌ بۆ لای پیّغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ).

ووتی:وازم لیّ بیّنه‌ من موحتاجم و خیّزانم به‌سه‌ره‌وه‌یه‌ ئیتر ناگه‌ڕیّمه‌وه‌.منیش به‌زه‌ییم پیّدا هاته‌وه‌ و به‌رم دا. بۆبه‌یانی یه‌كه‌ی پیّغه‌مبه‌ر(ﷺ) فه‌رمووی پیّم :(ئه‌ی ئه‌بو هوره‌یره‌ دیله‌كه‌ت چی لیّ هات؟) ئه‌ی پیّغه‌مبه‌ری خوا شكاتی حالّی خۆی ده‌كرد كه‌ موحتاجه‌ و مالّ و مندالّی

هه‌یه،منیش به‌زه‌ییم پێیدا هاته‌وه و به‌رم دا،فه‌رمووی:((دڵنیا به ئه‌و درۆی له‌گه‌ڵدا كردیت و ده‌شگه‌ڕێته‌وه)).

سێیه‌م شه‌و دیسان خۆم مه‌ڵاس دا بۆی هاته‌وه و خۆراكی برد منیش گرتم و ووتم:دڵنیا به به‌رزت ده‌كه‌مه‌وه بۆ لای پێغه‌مبه‌ری خوا(ﷺ) ئه‌مه ئیتر ئاخر جاره سێ جاره تۆ به‌حسابی خۆت ناگه‌ڕێیته‌وه،پاشان ده‌گه‌ڕێیته‌وه.وتی: به‌رم ده هه‌ندێ وشه‌ت فێرده‌كه‌م خوا به‌هۆیه‌وه سودت پێ ده‌گه‌یه‌نێت.

ووتم:كامانه‌ن؟ووتی: ئه‌گه‌ر چویته سه‌ر جێگا بۆ نوستن ئایه‌تی كورسی بخوێنه ﴿الله لا اله الا هو الحي القيوم﴾تا ته‌واوی ئایه‌ته‌كه.ئیتر تابه‌یانی خوا پارێزگارێكت له‌سه‌ر داده‌نێ یه‌ك شه‌یتان لێت نزیك نابێته‌وه.

جا ئه‌وان له هه‌موو شتێك زیاتر سووربون له‌سه‌ر خێر و چاكه.پێغه‌مبه‌ر(ﷺ)فه‌رمووی: ((بێگومان ئه‌و ڕاستی له‌گه‌ڵ تۆ كرد به‌ڵام خۆی درۆزنه،ئه‌بو هوره‌یره ئایا ده‌زانیت سێ شه‌وه تۆ قسه له‌گه‌ڵ كێ ده‌كه‌یت؟))ووتم:نه‌خێر.فه‌رمووی:((ئه‌وه شه‌یتان بوو)).

## چیرۆكی بیست و سێ

## جیهاد له‌پێناوی خوا له‌ناو ده‌ریادا

**عَنْ إِسْحَاقَ بْنِ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ أَبِي طَلْحَةَ، عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِكٍ ـ رضى الله عنه ـ أَنَّهُ سَمِعَهُ يَقُولُ كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَدْخُلُ عَلَى أُمِّ حَرَامٍ بِنْتِ مِلْحَانَ، فَتُطْعِمُهُ، وَكَانَتْ أُمُّ حَرَامٍ تَحْتَ عُبَادَةَ بْنِ الصَّامِتِ، فَدَخَلَ عَلَيْهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَأَطْعَمَتْهُ وَجَعَلَتْ تَفْلِي رَأْسَهُ، فَنَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ. قَالَتْ فَقُلْتُ وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ ( نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَىَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ، يَرْكَبُونَ ثَبَجَ هَذَا الْبَحْرِ، مُلُوكًا عَلَى الأَسِرَّةِ، أَوْ مِثْلُ الْمُلُوكِ عَلَى الأَسِرَّةِ ) . شَكَّ إِسْحَاقُ. قَالَتْ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي مِنْهُمْ. فَدَعَا لَهَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ ثُمَّ وَضَعَ رَأْسَهُ، ثُمَّ اسْتَيْقَظَ وَهُوَ يَضْحَكُ فَقُلْتُ وَمَا يُضْحِكُكَ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ ( نَاسٌ مِنْ أُمَّتِي عُرِضُوا عَلَىَّ، غُزَاةً فِي سَبِيلِ اللَّهِ ). كَمَا قَالَ فِي الأَوَّلِ. قَالَتْ فَقُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ، ادْعُ اللَّهَ أَنْ يَجْعَلَنِي**

**منهم. قَالَ ( أنتِ مِنَ الأوَّلِينَ ( . فَرَكِبَتِ الْبَحْرَ فِي زَمَانِ مُعَاوِيَةَ بْنِ أَبِي سُفْيَانَ، فَصُرِعَتْ عَنْ دابَّتِها حِينَ خَرَجَتْ مِنَ الْبَحْرِ، فَهَلَكَتْ. (البخاري/٢٧٨٩)**

ئەنەسی كوڕی مالیك(خوای لیّ ڕازی بێت)دەفەرموێت:

پیغەمبەری خوا(ﷺ) عادەتی وا بوو دەچوو بۆ ماڵی ئوم حەرام كچی میلحان (خوای لیّ ڕازی بێت) و ئەویش خۆراكی پیّ دەدا(أم حرام) خێزانی(عبادە)یكوڕی(صامت)بوو.ڕۆژێك پێغەمبەر(ﷺ)چوو بۆ ماڵیان،ئەویش خۆراكی پێدا و پاشان سەری دەدۆزی،پێغەمبەریش (ﷺ)خەوی لێكەوت پاشان بە پێكەنینەوە خەبەری بوەوە، (أم حرام)یش دەڵیّ:بەچی پێدەكەنی ئەی پێغەمبەری خوا؟ئەویش فەرمووی:(( كەسانێكم لە ئومەتەكەم پیّ نیشاندرا كە ئەجەنگان لەڕێگەی خوادا،سوار پشتی ئەم دەریایە بووبوون،پادشا بوون لەسەر تەخت،یاخود وەك پادشا وابوون لەسەر تەخت))(إسحاق كەریوایەتی كردوە دوودڵە)

دەڵیّ: ووتم: ئەی پێغەمبەری خوا لەخوا بپاڕێرەوە كە بمكات بەیەكیّ لەوانە.ئەویش بۆی دەپاڕێتەوە.پاشان سەر دەنێتەوە و خەوی لیّ دەكەوێتەوە، پاشان دووبارە بە پێكەنینەوە خەبەری دەبێتەوە.دەڵیّ:ووتم:بەچی پێدەكەنی ئەی پێغەمبەری خوا؟ فەرمووی:((كەسانێكم لەئومەتەكەم پیّ نیشاندرا لەڕێی خوادا ئەجەنگان))وەك لەجاری پێشوودا فەرمووی.منیش ووتم:ئەی پێغەمبەری خوا داوا لەخوا بكە كەبم كات بەیەكیّ لەوانە.فەرمووی:((تۆ لەپێشووەكانیت))جا(أم حرام)دەمێنێتەوە تا لەسەردەمی (موعاویە)دا (خوای لیّ ڕازی بێت)سواری كەشتی دەبێت بەناودەریادا،كاتیّ لەدەریاكە دەرچوو لەسەر وڵاخەكەی كەوتە خوارەوە و شەهید بوو.

# چیرۆكی بیست و چوار

## پیاوانێك كه‌ ڕاستیان كرد له‌و په‌یمانه‌ی به‌خوایان دابوو

عن أَبي هُرَيْرَةَ (رضى الله عنه) قَالَ بَعَثَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عَشَرَةَ رَهْطٍ سَرِيَّةً عَيْنًا، وَأَمَّرَ عَلَيْهِمْ عَاصِمَ بْنَ ثَابِتٍ الأَنْصَارِيَّ جَدَّ عَاصِمِ بْنِ عُمَرَ بن الخطاب، فَانْطَلَقُوا حَتَّى إِذَا كَانُوا بِالْهَدَأَةِ وَهْوَ بَيْنَ عُسْفَانَ وَمَكَّةَ ذُكِرُوا لِحَىٍّ مِنْ هُذَيْلٍ يُقَالُ لَهُمْ بَنُو لِحْيَانَ، فَنَفَرُوا لَهُمْ قَرِيبًا مِنْ مِائَتَىْ رَجُلٍ، كُلُّهُمْ رَامٍ، فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ حَتَّى وَجَدُوا مَأْكَلَهُمْ تَمْرًا تَزَوَّدُوهُ مِنَ الْمَدِينَةِ فَقَالُوا هَذَا تَمْرُ يَثْرِبَ. فَاقْتَصُّوا آثَارَهُمْ، فَلَمَّا رَآهُمْ عَاصِمٌ وَأَصْحَابُهُ لَجَئُوا إِلَى فَدْفَدٍ، وَأَحَاطَ بِهِمُ الْقَوْمُ فَقَالُوا لَهُمُ انْزِلُوا وَأَعْطُونَا بِأَيْدِيكُمْ، وَلَكُمُ الْعَهْدُ وَالْمِيثَاقُ، وَلاَ نَقْتُلُ مِنْكُمْ أَحَدًا. قَالَ عَاصِمُ بْنُ ثَابِتٍ أَمِيرُ السَّرِيَّةِ أَمَّا أَنَا فَوَاللَّهِ لاَ أَنْزِلُ الْيَوْمَ فِي ذِمَّةِ كَافِرٍ، اللَّهُمَّ أَخْبِرْ عَنَّا نَبِيَّكَ. فَرَمَوْهُمْ بِالنَّبْلِ، فَقَتَلُوا عَاصِمًا فِي سَبْعَةٍ، فَنَزَلَ إِلَيْهِمْ ثَلاَثَةُ رَهْطٍ بِالْعَهْدِ وَالْمِيثَاقِ، مِنْهُمْ خُبَيْبٌ الأَنْصَارِيُّ وَابْنُ دَثِنَةَ وَرَجُلٌ آخَرُ، فَلَمَّا اسْتَمْكَنُوا مِنْهُمْ أَطْلَقُوا أَوْتَارَ قِسِيِّهِمْ فَأَوْثَقُوهُمْ فَقَالَ الرَّجُلُ الثَّالِثُ هَذَا أَوَّلُ الْغَدْرِ، وَاللَّهِ لاَ أَصْحَبُكُمْ، إِنَّ لِي فِي هَؤُلاَءِ لأُسْوَةً. يُرِيدُ الْقَتْلَى، فَجَرَّرُوهُ وَعَالَجُوهُ عَلَى أَنْ يَصْحَبَهُمْ فَأَبَى فَقَتَلُوهُ، فَانْطَلَقُوا بِخُبَيْبٍ وَابْنِ دَثِنَةَ حَتَّى بَاعُوهُمَا بِمَكَّةَ بَعْدَ وَقْعَةِ بَدْرٍ، فَابْتَاعَ خُبَيْبًا بَنُو الْحَارِثِ بْنِ عَامِرِ بْنِ نَوْفَلِ بْنِ عَبْدِ مَنَافٍ، وَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ قَتَلَ الْحَارِثَ بْنَ عَامِرٍ يَوْمَ بَدْرٍ، فَلَبِثَ خُبَيْبٌ عِنْدَهُمْ أَسِيرًا، فَأَخْبَرَنِي عُبَيْدُ اللَّهِ بْنُ عِيَاضٍ أَنَّ بِنْتَ الْحَارِثِ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهُمْ حِينَ اجْتَمَعُوا اسْتَعَارَ مِنْهَا مُوسَى يَسْتَحِدُّ بِهَا فَأَعَارَتْهُ، فَأَخَذَ ابْنًا لِي وَأَنَا غَافِلَةٌ حِينَ أَتَاهُ قَالَتْ فَوَجَدْتُهُ مُجْلِسَهُ عَلَى فَخِذِهِ وَالْمُوسَى بِيَدِهِ، فَفَزِعْتُ فَزْعَةً عَرَفَهَا خُبَيْبٌ فِي وَجْهِي فَقَالَ تَخْشَيْنَ أَنْ أَقْتُلَهُ مَا كُنْتُ لأَفْعَلَ ذَلِكَ. وَاللَّهِ مَا رَأَيْتُ أَسِيرًا قَطُّ خَيْرًا مِنْ خُبَيْبٍ، وَاللَّهِ لَقَدْ وَجَدْتُهُ يَوْمًا يَأْكُلُ مِنْ قِطْفِ عِنَبٍ فِي يَدِهِ، وَإِنَّهُ لَمُوثَقٌ فِي الْحَدِيدِ، وَمَا بِمَكَّةَ مِنْ ثَمَرٍ وَكَانَتْ تَقُولُ إِنَّهُ لَرِزْقٌ مِنَ اللَّهِ رَزَقَهُ خُبَيْبًا، فَلَمَّا خَرَجُوا مِنَ الْحَرَمِ لِيَقْتُلُوهُ فِي الْحِلِّ، قَالَ لَهُمْ خُبَيْبٌ ذَرُونِي أَرْكَعْ رَكْعَتَيْنِ. فَتَرَكُوهُ، فَرَكَعَ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ قَالَ لَوْلاَ أَنْ تَظُنُّوا أَنَّ مَا بِي جَزَعٌ لَطَوَّلْتُهَا اللَّهُمَّ أَحْصِهِمْ عَدَدًا. وَلَسْتُ أُبَالِي حِينَ أُقْتَلُ مُسْلِمًا عَلَى أَىِّ شِقٍّ كَانَ لِلَّهِ مَصْرَعِي وَذَلِكَ فِي ذَاتِ الإِلَهِ وَإِنْ يَشَأْ يُبَارِكْ عَلَى أَوْصَالِ شِلْوٍ مُمَزَّعِ فَقَتَلَهُ ابْنُ الْحَارِثِ، فَكَانَ خُبَيْبٌ هُوَ سَنَّ الرَّكْعَتَيْنِ لِكُلِّ امْرِئٍ مُسْلِمٍ قُتِلَ صَبْرًا،

**فاستجابَ اللهُ لِعاصِمِ بْنِ ثابِتٍ يَوْمَ أُصِيبَ، فَأَخْبَرَ النَّبِيُّ ﷺ أَصْحابَهُ خَبَرَهُمْ وما أُصِيبُوا، وَبَعَثَ ناسٌ مِنْ كُفَّارِ قُرَيْشٍ إِلَى عَاصِمٍ حِينَ حُدِّثُوا أَنَّهُ قُتِلَ لِيُؤْتَوْا بِشَيْءٍ مِنْهُ يُعْرَفُ، وَكَانَ قَدْ قَتَلَ رَجُلاً مِنْ عُظَمَائِهِمْ يَوْمَ بَدْرٍ، فَبُعِثَ عَلَى عَاصِمٍ مِثْلُ الظُّلَّةِ مِنَ الدَّبْرِ، فَحَمَتْهُ مِنْ رَسُولِهِمْ، فَلَمْ يَقْدِرُوا عَلَى أَنْ يَقْطَعَ مِنْ لَحْمِهِ شَيْئًا. (البخاري/٣٠٤٥)**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

پێغەمبەر(ﷺ) سریەیەکی نارد کە پێکهاتبوون لە دەکەس بۆ چاو ساغی و (عاصم)ی کوڕی(ثابیت)ی ئەنصاریی کردە ئەمیریان،کە باپیری عاصمی کوڕی عومەری کوڕی خطاب بوو.ئەوانیش بەڕێکەوتن هەتا گەیشتنە((الهدأة))کە جێگایەکە لەنێوان عەسفان و مەککە.هەواڵ درا بەهۆزێکی(بەنی هوزەیل)پێیان دەوترێ ((بنو لحیان))ئەوانیش دووسەدکەسیان کۆ کردەوە کە گشتیان تیرەنداز بوون، بەشوێنیاندا ڕۆیشتن تا جێگای خۆراکەکەیان دۆزینەوە کە خورمایان خوارد بوو.لە مەدینەوە وەك توێشوو هێنابوویان.ووتیان ئەمە خورمای (یەثریبە).جا پەلە بکەن بەجێ پێکانیاندا برۆن.کاتێ عاصم و هاوەڵەکانی ئەوانیان دی،پەنایان بردە فەدفەد ئەوانیش دەوریان دان پێ یان وتن:دابەزن و خۆتان بدەن بەدەستەوە،پەیمانتان دەدەینێ و کەستان ناکوژین. (عاصمی کوڕی ثابیت) کە ئەمیری سریەکە بوو ووتی: بەنیسبەت منەوە سوێند بەخوا ئەمڕۆ من ناچمە پەنای هیچ بێ بڕوایەك،خوایە هاوارت لێ دەکەین هەواڵمان بگەیەنیتە پێغەمبەرەکەت کتوپڕ. بت پەرستەکان کەوتنە هێرش بۆ سەریان بە مەنجەنیق سەرەنجام حەوتیان لێ شەهید بوو یەکێکیان عاصم بوو. سێ کەسەکەی تریان لەسەر وەعد و پەیمان دابەزینە خوارەوە کە خوبەیبی ئەنصاری و زەیدی کوڕی دەثینە و پیاوێکی تر بوون. کاتێ هاتنە بەر دەستیان دەست و قاچیان بەستنەوەو و کەلەپچەیان کردن. پیاوی سێیەم وتی: ئەمە سەرەتای پەیمان شکاندنیانە،سوێند بەخوا لەگەڵتاندا نایەم ئەوان پێشەنگن بۆمن (مەبەستی کوژراوەکانە) ئەوانیش کەوتنە کێش کردنی و لێدانی ، زۆری لەگەڵ خەریك بوون نەچوو لەگەڵیان سەرەنجام شەهیدیان کرد، ئینجا خوبەیب و زەیدیان برد لەگەڵ خۆیان تا لەمەککە فرۆشتنیان، ئەمە دوای جەنگی بەدربوو. ئەوە بوو((بنو الحارث بن عامر)) خوبەیبیان کڕی، کە کاتی خۆی

خوبەیب لەجەنگی بەدردا حاریث كوڕی عامیری كوشتبوو، بۆیە خوبەیب بەدیلیی لەلایان مایەوە. عوبەیدوڵڵای كوڕی عیاض هەواڵی دامیّ كە كچەكەی حاریث بۆی گێراوەتەوە كە ئەوان كاتیّ كۆبونەوە بۆ كوشتنی خوبەیب داوای گوێزانێكی كرد،خۆی پیّ پاك بكاتەوە، ئەویش دەیداتیّ. ئەوەبوو كاتیّ ئاگام لە خۆم نەبوو. كوڕەكەمی بردبووە لای خۆی لەسەر ڕانی دای نابوو گوێزانەكەشی بەدەستەوە بوو،منیش زۆر ترسام و ڕەنگم تێك چوو، خوبەیب هەستی پیّ كردم.ووتی: دەترسیت بیكوژم. هەرگیز من شتی واناكەم و ئەوە ڕەوشتی من نییە. سوێند بەخوا هەرگیز دیلێكم نەدیوە لە خوبەیب چاكتر. سوێند بەخوا ڕۆژێكیان تەماشام كرد هێشوویەك ترێی لە بەردەست دایەو دەیخوات، دەست و پێشی كۆت و زنجیر بوو، لەو ڕۆژەشدا یەك میوە لە مەككەدا نەبوو، بەڕاستی ئەوە ڕۆزییەك بوو خوای گەورە بۆ خوبەیبی ناردبوو. كاتیّ بت پەرستەكان لە حەرەم دەریان كرد بۆ ئەوەی لە دەرەوەی حەرەم بیكوژن، خوبەیب پێی ووتن: لێم گەڕێن با دووڕكات نوێژ بكەم. ئەوانیش لێی گەڕان دووڕكات نوێژی كرد و فەرمووی: ئەگەر لەبەر ئەوە نەبووایە كە بڵێن لە مردن دەترسێت،نوێژەكەم درێژ دەكردەوە.

خوایە یەك یەك لەناویان ببە.

ولست أبالي حين أُقتل مسلماً

على أي شقٍ كان لله مصرعي

... ...

و ذلك في ذات الإله و أن يشأ

يبارك على أوصال شلو ممزّعِ

هیچ گرنگ نییە بەلامەوە كاتێك بە موسڵمانی دەكوژرێم.

بە هەر لایەكدا بكەوم و بمرم لەڕێی خوادا.

ئەوەش لەبەر خاتری زاتی خوایە و ئەگەر بیەوێت.

بەرەكەت و سۆز دەڕژێت بەسەر لاشەی پارچە پارچە كراودا.

ئینجا كوڕەكەی حاریث شەهیدی كرد. خوبەیبیش ئەو دووڕكاتەی وەك سوننەتێك داهێنا بۆ هەرموسڵمانێك كەبەو جۆرە شەهید دەكریّ و دەكوژریّ.خوای گەورەش وەڵامی دوعاكەی

عاصمی كوڕی ثابیتی دایەوە كە پێش شەهید بوونی پاڕایەوە، ئەوە بوو پێغەمبەر (ﷺ) هەواڵ و بەسەرهاتی ئەوانی گێڕایەوە بۆ هاوەڵانی.

بێ باوەڕانی قورەیشیش چەند كەسێكیان نارد كەزانیان عاصم كوژراوە. چونكە عاصم لەڕۆژی بەدردا یەكێك لە سەرگەورەكانی قورەیشی كوشتبوو، ناردیان تا پارچەیەك لە جەستەی عاصم بێنن بۆ دڵنیایی خۆیان، بەڵام خوای گەورە كۆمەڵێك زەردەواڵەی وەكو چەترێك ناردە سەر جەنازەكەی عاصم، ئیتر كەس نەیوێرا لێی نزیك بێتەوە و گۆشت لەگیانی ببڕێت.

## چیرۆكی بیست و پێنج

## قورئان خوێنە شەهیدەكان

**عَنْ أَنَسٍ ( رضى الله عنه ) قَالَ بَعَثَ النَّبِيُّ ﷺ أَقْوَامًا مِنْ بَنِي سُلَيْمٍ إِلَى بَنِي عَامِرٍ فِي سَبْعِينَ، فَلَمَّا قَدِمُوا، قَالَ لَهُمْ خَالِي أَتَقَدَّمُكُمْ، فَإِنْ أَمَّنُونِي حَتَّى أُبَلِّغَهُمْ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ وَإِلاَّ كُنْتُمْ مِنِّي قَرِيبًا. فَتَقَدَّمَ، فَأَمَّنُوهُ، فَبَيْنَمَا يُحَدِّثُهُمْ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ إِذْ أَوْمَئُوا إِلَى رَجُلٍ مِنْهُمْ، فَطَعَنَهُ فَأَنْفَذَهُ فَقَالَ اللَّهُ أَكْبَرُ، فُزْتُ وَرَبِّ الْكَعْبَةِ. ثُمَّ مَالُوا عَلَى بَقِيَّةِ أَصْحَابِهِ فَقَتَلُوهُمْ، إِلاَّ رَجُلاً أَعْرَجَ صَعِدَ الْجَبَلَ. قَالَ هَمَّامٌ فَأُرَاهُ آخَرَ مَعَهُ، فَأَخْبَرَ جِبْرِيلُ ( عَلَيْهِ السَّلاَمُ ) النَّبِيَّ ﷺ أَنَّهُمْ قَدْ لَقُوا رَبَّهُمْ، فَرَضِيَ عَنْهُمْ وَأَرْضَاهُمْ، فَكُنَّا نَقْرَأُ أَنْ بَلِّغُوا قَوْمَنَا أَنْ قَدْ لَقِينَا رَبَّنَا فَرَضِيَ عَنَّا وَأَرْضَانَا. ثُمَّ نُسِخَ بَعْدُ، فَدَعَا عَلَيْهِمْ أَرْبَعِينَ صَبَاحًا، عَلَى رِعْلٍ وَذَكْوَانَ وَبَنِي لِحْيَانَ وَبَنِي عُصَيَّةَ الَّذِينَ عَصَوُا اللَّهَ وَرَسُولَهُ ﷺ. ( البخاري/٢٨٠١ )**

**ئەنەسی كوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:**

**((پێغەمبەر (ﷺ) هەندێ پیاوی لە تیرەی (بنی سُلَیم) نارد بۆ ناو تیرەی (بنی عامر) كە حەفتا كەس بوون كاتێ نزیكیان بوونەوە و چوونە ناویان خاڵم (واتە حرام بن ملحان) بە هاوەڵەكانی ووت: من لەپێشتانەوە دەڕۆم ئەگەر ئەمانیان دامێ تا بانگەوازی پێغەمبەریان پێ دەگەیەنم زۆر باشە، ئەگینا ئێوە هەر لەم نزیكانەدا بن. جا كاتێ گەیشتە بەرەوە و ئەمانیان داپێی، لەو كاتەدا**

كه په‌یامی پێغه‌مبه‌ری (ﷺ) بۆ باس ده‌كردن كتوپڕ ئامازه‌یان دا به‌پیاوێكیان و ئه‌ویش ڕمێكی لێ داو جه‌رگ و دڵی بڕی، حیرامیش ده‌سبه‌جێ ووتی:الله اكبر فُزتُ و ربُّ الكعبه. ((پاشان هه‌ڵمه‌تیان برده سه‌ر هاوه‌ڵه‌كانی تری و هه‌موویان شه‌هیدكردن جگه له پیاوێكی شه‌لیان كه به شاخه‌كه‌دا سه‌ركه‌وت))

همام ده‌فه‌رموێت: پێم وایه پیاوێكی تری له‌گه‌ڵ دابوو بێت. ئینجا جبریل(عليه السلام) هه‌واڵی دا به‌پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) كه (أنهم قد لقوا ربّهم فرچی عنهم و ارچاهم) واته ئه‌وان گه‌یشتن به په‌روه‌ردگاری خۆیان لێیان ڕازی بوو وه ڕازیشی كردن. جا ئێمه ئه‌وه‌مان له قورئاندا ده‌خوێنده‌وه.

(أن بلّغوا قومنا أن قد لقينا ربّنا فرچی عنا وأرچانا) پاشان ئه‌و ئایه‌ته نه‌سخ بوه‌وه. پێغه‌مبه‌ریش چل به‌یانی له نوێژدا دوعای له (ڕعل و ژكوان و بنی لحیان و بنی عُصیّه) كرد كه عاسی بوون له خوا و پێغه‌مبه‌ر(ﷺ).

## چیرۆكی بیست و شه‌ش

## پیاوانێك ڕاستیان كرد

**عَنْ أَنَسٍ ( رضى الله عنه ) قَالَ غَابَ عَمِّي أَنَسُ بْنُ النَّضْرِ عَنْ قِتَالِ بَدْرٍ فَقَالَ يَا رَسُولَ اللَّهِ، غِبْتُ عَنْ أَوَّلِ قِتَالٍ قَاتَلْتَ الْمُشْرِكِينَ، لَئِنِ اللَّهُ أَشْهَدَنِي قِتَالَ الْمُشْرِكِينَ لَيَرَيَنَّ اللَّهُ مَا أَصْنَعُ، فَلَمَّا كَانَ يَوْمُ أُحُدٍ وَانْكَشَفَ الْمُسْلِمُونَ قَالَ ( اللَّهُمَّ إِنِّي أَعْتَذِرُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاَءِ ـ يَعْنِي أَصْحَابَهُ ـ وَأَبْرَأُ إِلَيْكَ مِمَّا صَنَعَ هَؤُلاَءِ ) يَعْنِي الْمُشْرِكِينَ ثُمَّ تَقَدَّمَ، فَاسْتَقْبَلَهُ سَعْدُ بْنُ مُعَاذٍ، فَقَالَ يَا سَعْدُ بْنَ مُعَاذٍ، الْجَنَّةَ، وَرَبِّ النَّضْرِ إِنِّي أَجِدُ رِيحَهَا مِنْ دُونِ أُحُدٍ. قَالَ سَعْدٌ فَمَا اسْتَطَعْتُ يَا رَسُولَ اللَّهِ مَا صَنَعَ. قَالَ أَنَسٌ فَوَجَدْنَا بِهِ بِضْعًا وَثَمَانِينَ ضَرْبَةً بِالسَّيْفِ أَوْ طَعْنَةً بِرُمْحٍ أَوْ رَمْيَةً بِسَهْمٍ، وَوَجَدْنَاهُ قَدْ قُتِلَ وَقَدْ مَثَّلَ بِهِ الْمُشْرِكُونَ، فَمَا عَرَفَهُ أَحَدٌ إِلاَّ أُخْتُهُ بِبَنَانِهِ. قَالَ أَنَسٌ كُنَّا نُرَى أَوْ نَظُنُّ أَنَّ هَذِهِ الآيَةَ نَزَلَتْ فِيهِ وَفِي أَشْبَاهِهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا مَا عَاهَدُوا اللَّهَ عَلَيْهِ إِلَى آخِرِ الآيَةِ. وَقَالَ إِنَّ أُخْتَهُ وَهْىَ تُسَمَّى الرُّبَيِّعَ كَسَرَتْ ثَنِيَّةَ امْرَأَةٍ فَأَمَرَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ بِالْقِصَاصِ، فَقَالَ أَنَسٌ**

**يا رسُولَ اللهِ، وَالّذي بَعَثَكَ بِالْحَقِّ لا تُكْسَرُ ثَنِيّتُها. فرضُوا بِالأرْشِ وتركُوا القصاص، فقال رسُولُ اللهِ ﷺ ( إنّ منْ عِبادِ اللهِ مَنْ لَوْ أقسَمَ على اللهِ لأبَرّهُ ) (البخاري/٢٨٠٦ )**

ئەنەسی کوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

ئەنەسی کوڕی نەضر کە (مامەی) غەزای بەدری بەنسیب نەبوو، فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) یەکەم جەنگێك تۆ دژی بت پەرستان جەنگایت من ئامادەی نەبووم و غایب بووم، جا بڕیار بێت ئەگەر خوای گەورە جەنگی بت پەرستانی هێنایەوە ئاراوە دەبێ خوای گەورە بی بینێ من چ کارێك دەکەم.

جا کە ڕۆژی ئوحود هاتە ئاراوە و موسڵمانان پشتیان لێ گیراو (شپرزە بوون) ئەنەس فەرمووی ((ئەی خوایە من مەعزەرەت دەێنمەوە بۆ ئەو کارەی ئەمان کردیان-واتە هاوەڵانی-وە بەریم لەکار و کردەوەی ئەوانەش-واتە بت پەرستان-)) پاشان کەوتە پێشڕەوی و سەعدی کوڕی مەعاذ بەڕەوڕووی بوەوە ئەنەس فەرمووی:((ئەی سەعدی کوڕی مەعاذ سوێند بەخوای (نەضر) من بۆنی بەهەشت دەکەم لەم دیوی کێوی ئوحود!)).

سەعد فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوا من نەم توانی وەکو ئەو بکەم. ئەنەسی کوڕی مالیك فەرمووی: کە شەهید بوو بینیمان هەشتا و ئەوەندە برینی پێوە بوو جێگەی شمشێر و ڕم و تیر، کە شەهیدیش بوو بوو بت پەرستان جەستەی پیرۆزیان ئەتك کردبوو، کەس نەینا سیەوە خوشکێکی نەبێت کە بە پەنجەیدا ناسیی یەوە. ئەنەسی کوڕی مالیك دەفەرموێت: ئێمە پێمان وابوو ئەو ئایەتە دەربارەی ئەو و ئەوانەی وەك ئەون هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت:((من المؤمنین رجال صدقوا ماعاهدوا الله علیه)) هەروەها دەفەرموێت: خوشکەکەی کە ناوی (ڕوبەیع) بوو ((دانی ژنێکی شکاند، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمانی دا بە تۆڵەکردنەوە لێی.ئەنەس فەرمووی: سوێند بەو کەسەی تۆی بە هەق و ڕاستی ڕەوانەکردوە ددانی ئەو ناشکێت. سەرەنجام کەس و کاری ژنەکە بە قەرەبوو کردنەوە ڕازی بوون و وازیان لە تۆڵە هێنا. پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی:((إنّ من عباد الله من لو أقسم علی الله لأبرّهُ)). واتە:((بێگومان

هەندێ بەندەی خوا هەیە ئەگەر سوێند لەسەر خوا بخوات خوای گەورە سوێندەكەی بۆ جێ جێ دەكات و دڵی ناشكێنێت)).

## چیرۆكی بیست و حەوت

## ئەوە چاكترە بۆتان لە خزمەت كار

**عن عَليٍّ بن أبي طالب، أنّ فاطمةَ (عَلَيهَا السَّلامُ) اشْتَكَتْ مَا تَلقَى منَ الرَّحَى ممَّا تَطحَنُ، فَبَلَغهَا أنّ رَسُولَ اللّه ﷺ أُتيَ بسَبْيٍ، فَأتَتْهُ تَسْألُهُ خَادمًا فَلَمْ تُوافقهُ، فَذَكَرَتْ لعَائشَةَ، فَجَاءَ النَّبيُّ ﷺ فَذَكَرَتْ ذلكَ عَائشَةُ لَهُ، فَأتَانَا وَقَدْ دَخَلْنَا مَضَاجعَنَا، فَذَهَبْنَا لنَقُومَ فَقَالَ (عَلَى مَكَانكُمَا) حَتَّى وَجَدْتُ بَرْدَ قَدَمَيْه عَلَى صَدْري فَقَالَ (ألا أدُلُّكُمَا عَلَى خَيْرٍ ممَّا سَألتُمَاهُ، إذا أخَذْتُمَا مَضَاجعَكُمَا فَكَبِّرَا اللّهَ أرْبَعًا وَثَلاثينَ، وَاحْمَدَا ثَلاثًا وَثَلاثينَ، وَسَبِّحَا ثَلاثًا وَثَلاثينَ، فَإنَّ ذلكَ خَيْرٌ لَكُمَا ممَّا سَألتُمَاهُ). (البخاري/٣١١٣)**

عەلی كوڕی ئەبوتالیب (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:
فاطیمە (خوای لێ ڕازی بێت) شەكوای حاڵی خۆی دەكرد بە هۆی ماندوبونی بە هاڕینی گەنمەوە. بیستبووی پێغەمبەر (ﷺ) هەندێك كە نیزەكی بۆ هاتبوو، چووە خزمەتی و داوای خزمەت كارێكی لێ كرد. ئەویش نەیدا پێی و فاطیمە ناڕازی بوو، پاشان لای عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) باسی كرد.پێغەمبەر (ﷺ) تەشریفی هات و عائیشە ئەوەی لاباس كردبوو. پاشان پێغەمبەر (ﷺ) هات بۆ لامان، لەو كاتەدا ئێمە ڕاكشابووین ویستمان هەستین فەرمووی: ((لە جێی خۆتان مەجوڵێن)) تا هەستم كرد بە فێنكی پێ كانی لەسەر سنگم، فەرمووی:((ئایا شتێكتان پێ نیشان نەدەم لەوە چاكتر بێت كە داواتان كردووە، كاتێ چوونە سەر جێگای نوستنتان سی و چوار جار بڵێن (الله اكبر) وە سی و سێ جار بڵێن (الحمد لله) وە سی و سێ جار بڵێن (سبحان الله) ئەوە چاكترە بۆتان لەوەی داواتان كردووە)).

# چیرۆكی بیست و هه‌شت

## كه‌س ته‌زكیه ناكه‌ین لای خوا

**عن خارجةُ بْنُ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، أنَّ أُمَّ العَلاءِ ـ امْرَأَةٌ مِنَ الأَنْصَارِ بَايَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم ـ أَخْبَرَتْهُ أَنَّهُمُ اقْتَسَمُوا الْمُهَاجِرِينَ قُرْعَةً. قَالَتْ فَطَارَ لَنَا عُثْمَانُ بْنُ مَظْعُونٍ، وَأَنْزَلْنَاهُ فِي أَبْيَاتِنَا، فَوَجِعَ وَجَعَهُ الَّذِي تُوُفِّيَ فِيهِ، فَلَمَّا تُوُفِّيَ غُسِّلَ وَكُفِّنَ فِي أَثْوَابِهِ دَخَلَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقُلْتُ رَحْمَةُ اللَّهِ عَلَيْكَ أَبَا السَّائِبِ، فَشَهَادَتِي عَلَيْكَ لَقَدْ أَكْرَمَكَ اللَّهُ. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم " وَمَا يُدْرِيكِ أَنَّ اللَّهَ أَكْرَمَهُ ". فَقُلْتُ بِأَبِي أَنْتَ يَا رَسُولَ اللَّهِ فَمَنْ يُكْرِمُهُ اللَّهُ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم " أَمَّا هُوَ فَوَاللَّهِ لَقَدْ جَاءَهُ الْيَقِينُ، وَاللَّهِ إِنِّي لأَرْجُو لَهُ الْخَيْرَ، وَوَاللَّهِ مَا أَدْرِي وَأَنَا رَسُولُ اللَّهِ مَاذَا يُفْعَلُ بِي ". فَقَالَتْ وَاللَّهِ لاَ أُزَكِّي بَعْدَهُ أَحَدًا أَبَدًا. حَدَّثَنَا أَبُو الْيَمَانِ، أَخْبَرَنَا شُعَيْبٌ، عَنِ الزُّهْرِيِّ، بِهَذَا وَقَالَ " مَا أَدْرِي مَا يُفْعَلُ بِهِ ". قَالَتْ وَأَحْزَنَنِي فَنِمْتُ، فَرَأَيْتُ لِعُثْمَانَ عَيْنًا تَجْرِي، فَأَخْبَرْتُ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فَقَالَ " ذَلِكَ عَمَلُهُ " (البخاري/٧٠٠٤)**

((أم العلاء)) كه‌ ئافره‌تێكی پشتیوانه‌ واته‌ له‌ (أنصاره‌كانه‌) و یه‌ كێكه‌ له‌وانه‌ی به‌یعه‌تی داوه‌ به‌ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ده‌فه‌رموێت:

پشتیوانه‌كان تیر و پشكیان ده‌كرد بۆ ناوی كۆچ كه‌ران، كه‌ كێ كێی به‌ر بكه‌وێت، ئێمه‌ش (عثمانی كوڕی مظعون)مان به‌ركه‌وت، هێنامانه‌وه‌ بۆ ماڵی خۆمان، ئه‌وه‌ بوو ئه‌و ئازاره‌ی توش هات كه‌ سه‌ره‌نجام بووه‌ هۆی وه‌فات كردنی ، كاتێ وه‌فاتی كرد، شۆررا و پۆشاكه‌كه‌ی خۆی كرا به‌ كفن بۆی، پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ) ته‌شریفی هێنا، منیش ووتم: ئه‌بو سائیب (ڕه‌حمه‌تی خوات له‌سه‌ر بێت). من شایه‌تم كه‌خوای گه‌وره‌ ڕێزی لێ نایت. پێغه‌مبه‌ری خواش (ﷺ) فه‌رمووی:((چۆن ده‌زانیت خوا ڕێزی لێ ناوه‌؟)) ووتم: باوكم به‌ قوربانت بێت ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا جا ئه‌گه‌ر خوا ڕێزی له‌و نه‌ نابێت ئه‌ی له‌ كێی ناوه‌؟ پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ)

فەرمووی:((بێگومان ئەو ئێستا گەیشتووە بە یەقین وەمن سوێند بەخوا ئومێدی خێری بۆ دەكەم، وە سوێند بەخوا من كە پێغەمبەری خوام نازانم چارەنووسم چۆن دەبێت)).

پاشان ((أم العلاء)) فەرمووی: سوێند بەخوا دوای ئەو هەرگیز تەزكیەی كەس ناكەم.

لە ریوایەتێكی تردا دەفەرموێت: غەمبار بووم خەوم لێ كەوت. بینیم (عثمان) كانی یەكی هەیە لەبەری دەڕوات، بۆ پێغەمبەرم گێڕایەوە، فەرمووی:((ئەوە كردەوەكانیەتی)).

## چیرۆكی بیست و نۆ

## بەزەیی هاتنەوە بە گیانداراندا

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ( رضى الله عنه ) أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ قَالَ ( بَيْنَا رَجُلٌ بِطَرِيقٍ، اشْتَدَّ عَلَيْهِ الْعَطَشُ فَوَجَدَ بِئْرًا فَنَزَلَ فِيهَا فَشَرِبَ، ثُمَّ خَرَجَ، فَإِذَا كَلْبٌ يَلْهَثُ يَأْكُلُ الثَّرَى مِنَ الْعَطَشِ، فَقَالَ الرَّجُلُ لَقَدْ بَلَغَ هَذَا الْكَلْبَ مِنَ الْعَطَشِ مِثْلُ الَّذِي كَانَ بَلَغَ مِنِّي، فَنَزَلَ الْبِئْرَ، فَمَلأَ خُفَّهُ مَاءً، فَسَقَى الْكَلْبَ، فَشَكَرَ اللَّهُ لَهُ، فَغَفَرَ لَهُ ) . قَالُوا يَا رَسُولَ اللَّهِ وَإِنَّ لَنَا فِي الْبَهَائِمِ لأَجْرًا فَقَالَ ( فِي كُلِّ ذَاتِ كَبِدٍ رَطْبَةٍ أَجْرٌ ). ( البخاري/٣٤٦٦ )**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:

((ڕۆژێكیان پیاوێك بەڕێیەكدا دەڕۆیشت، تینوویەتی زۆری بۆ هێنابوو تووشی بیرێك بوو، دابەزیە ناوی و ئاوی خواردەوە و هاتە دەرەوە، لەو كاتەدا سەگێكی بینی هەناسە بركێیەتی و زمان دێنێ بە ئەرزدا لە تینوێتیدا، كابرا ووتی: بێگومان من پێشتر چەندم تینوو بوو، ئەم سەگەش بەو جۆرە تینوویەتی. بۆیە دابەزیە ناو بیرەكە و پێڵاوەكەی (خوففەكەی) پڕ كرد لە ئاو و دای بە سەگەكە، پاشان شوكری خوای كرد و خوای گەورەش لێی خۆش بوو.

ووتیان:ئەی پێغەمبەری خوا بە چاكەكردن لەگەڵ گیانداراندا پاداشت دەدرێینەوە؟ فەرمووی: ((لە چاكەكردن لەگەڵ هەموو گیاندارێكی ناوسك تەڕدا (واتە زیندەوەر) پاداشت هەیە)).

# چیرۆكی سی

## له شته سه‌رسوڕهێنه‌ره‌كانی په‌روه‌ردگارمان

**عَنْ عَائِشَةَ، أنَّ وَلِيدَةً، كَانَتْ سَوْدَاءَ لِحَيٍّ مِنَ الْعَرَبِ، فَأَعْتَقُوهَا، فَكَانَتْ مَعَهُمْ قَالَتْ فَخَرَجَتْ صَبِيَّةٌ لَهُمْ عَلَيْهَا وِشَاحٌ أَحْمَرُ مِنْ سُيُورٍ قَالَتْ فَوَضَعَتْهُ أَوْ وَقَعَ مِنْهَا، فَمَرَّتْ بِهِ حُدَيَّاةٌ وَهُوَ مُلْقًى، فَحَسِبَتْهُ لَحْمًا فَخَطَفَتْهُ قَالَتْ فَالْتَمَسُوهُ فَلَمْ يَجِدُوهُ قَالَتْ فَاتَّهَمُونِي بِهِ قَالَتْ فَطَفِقُوا يُفَتِّشُونَ حَتَّى فَتَّشُوا قُبُلَهَا قَالَتْ وَاللَّهِ إِنِّي لَقَائِمَةٌ مَعَهُمْ، إِذْ مَرَّتِ الْحُدَيَّاةُ فَأَلْقَتْهُ قَالَتْ فَوَقَعَ بَيْنَهُمْ قَالَتْ فَقُلْتُ هَذَا الَّذِي اتَّهَمْتُمُونِي بِهِ ـ زَعَمْتُمْ ـ وَأَنَا مِنْهُ بَرِيئَةٌ، وَهُوَ ذَا هُوَ قَالَتْ فَجَاءَتْ إِلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَأَسْلَمَتْ. قَالَتْ عَائِشَةُ فَكَانَ لَهَا خِبَاءٌ فِي الْمَسْجِدِ أَوْ حِفْشٌ قَالَتْ فَكَانَتْ تَأْتِينِي فَتَحَدَّثُ عِنْدِي قَالَتْ فَلاَ تَجْلِسُ عِنْدِي مَجْلِسًا إِلاَّ قَالَتْ (وَيَوْمَ الْوِشَاحِ مِنْ أَعَاجِيبِ رَبِّنَا) (أَلاَ إِنَّهُ مِنْ بَلْدَةِ الْكُفْرِ أَنْجَانِي) قَالَتْ عَائِشَةُ فَقُلْتُ لَهَا مَا شَأْنُكِ لاَ تَقْعُدِينَ مَعِي مَقْعَدًا إِلاَّ قُلْتِ هَذَا قَالَتْ فَحَدَّثَتْنِي بِهَذَا الْحَدِيثِ. (البخاري/٤٣٩)**

دایكمان عائیشه (خوای لێ ڕازی بێت) ده‌فه‌رموێت:

هۆزێكی عه‌ره‌ب هه‌بوون كه‌نیزه‌كێكی ڕه‌شیان هه‌بوو، ئازادیان كرد، هه‌ر له‌گه‌ڵ خۆیاندا ده‌ژیا، ڕۆژێكیان كچۆڵه‌یه‌كیان هاته ده‌ره‌وه له‌ماڵ به‌رگێكی سووری له‌به‌ردابوو له په‌ڕ دروست كرابوو (وه‌ك چارشێو وابوو) ، له‌به‌ری خۆی داماڵی یان لێی كه‌وته خواره‌وه، كتوپڕ قه‌له‌ڕه‌شێك هات وای زانی گۆشته ڕفاندی، ده‌ڵێت: كه‌س و كاری منداڵه‌كه زۆر گه‌ڕان به شوێن (چارشێوه‌كه‌دا) نه‌یان دۆزییه‌وه، منیان تاوانبار كرد، هه‌موو شوێنێك گه‌ڕان ناو له‌شی منیشیان پشكنی، ده‌ڵێت: سوێند به‌خوا من و ئه‌وانیش ڕاوه‌ستابووین كه قه‌له‌ڕه‌شه‌كه هاته‌وه و چارشێوی منداڵه‌كه‌ی فڕێ دایه خواره‌وه له ناویاندا. ووتم: ئه‌وه چارشێوه‌كه‌یه كه منتان تاوانبار ده‌كرد به دزینی و منیش بێ ئاگابوم لێی.ئه‌وه‌تا. عائیشه ده‌فه‌رموێت: له ئه‌نجام دا هاته خزمه‌تی پێغه‌مبه‌ری خوا (ﷺ)

و موسڵمان بوو. دایکمان عائیشه دەفەرموێت: کەژاوەیەك یان ژوورێکی بچووکی لە مزگەوت دا هەبوو، زۆرجار دەهات بۆلام و قسەی بۆ دەکردم. هەرجارێك بهاتایە ئەم شیعرەی دەووت:

و یوم الوشاح من أعاجیب ربنا          ألا انه من بلدة الکفر أنجاني

واتە ڕۆژی چارشێوەکە لە موعجیزەکانی پەروەردگارمانە .

بەڕاستی ئەو زاتە منی لە وولاتی بی بڕوایی نەجات دا .

دایکمان عائیشه دەفەرموێت: پێم ووت ئەوە چیتە هەرجارێك بێیت لام دابنیشیت ئەم دێرە شیعرە دەڵێیت؟ دەفەرمووێ: ئەویش ئەم بەسەرهاتەی بۆ گێڕامەوە.

## چیرۆکی سی و یەك

## تێگەیشتوویی ئەبو بەکری سدیق (خوای لێ ڕازی بێت)

**عَنْ أَبِي سَعِيدِ الْخُدْرِيِّ، قَالَ خَطَبَ النَّبِيُّ ﷺ فَقَالَ ( إِنَّ اللَّهَ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ، فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ ) . فَبَكَى أَبُو بَكْرٍ ـ رضى الله عنه ـ فَقُلْتُ فِي نَفْسِي مَا يُبْكِي هَذَا الشَّيْخَ إِنْ يَكُنِ اللَّهُ خَيَّرَ عَبْدًا بَيْنَ الدُّنْيَا وَبَيْنَ مَا عِنْدَهُ فَاخْتَارَ مَا عِنْدَ اللَّهِ، فَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ هُوَ الْعَبْدَ، وَكَانَ أَبُو بَكْرٍ أَعْلَمَنَا. قَالَ ( يَا أَبَا بَكْرٍ لاَ تَبْكِ، إِنَّ أَمَنَّ النَّاسِ عَلَيَّ فِي صُحْبَتِهِ وَمَالِهِ أَبُو بَكْرٍ، وَلَوْ كُنْتُ مُتَّخِذًا خَلِيلاً مِنْ أُمَّتِي لاَتَّخَذْتُ أَبَا بَكْرٍ، وَلَكِنْ أُخُوَّةُ الإِسْلاَمِ وَمَوَدَّتُهُ، لاَ يَبْقَيَنَّ فِي الْمَسْجِدِ بَابٌ إِلاَّ سُدَّ إِلاَّ بَابُ أَبِي بَكْرٍ). (البخاري/٤٦٦)**

**ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:**

**ڕۆژێکیان پێغەمبەر (ﷺ) ووتاری دەدا فەرمووی:((خوای گەورە بەندەیەکی سەربەست کرد کە ئایا دونیا هەڵ دەبژێرێت یان ڕەزامەندیی خوا و بەهەشت و لیقای خوا، ئەویش لیقای خوای هەڵبژارد)). لەو کاتەدا ئەبوبەکری سدیق (خوای لێ ڕازی بێت) دەستی کردە گریان. منیش لە دڵی خۆمدا وتم: ئەم پیاوە ڕیش سپییە بۆ دەگری. کە خوا بەندەیەکی خۆی سەربەست کردبێت**

دونیا هەڵبژێرێت یان لیقای خوا؟ ئەوەبوو بەندەکە پێغەمبەری خوا بوو (ﷺ) ئەبو بەکریش زاناترینمان بوو.

پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:(( ئەی ئەبو بەکر مەگری. بەڕاستی کەس لە هاوەڵێتی و ماڵ و ساماندا هێندەی ئەبوبەکر منەت و چاکەی بە سەرمەوە نییە. خۆ ئەگەر لە ئومەتەکەم کەسێکم بە دۆست و هاوەڵی هەمیشەیی هەڵبژاردایە ئەبوبەکرم هەڵدەبژارد. بەڵام ئەوە برایەتی و خۆشەویستییەکە لەنێوانماندا کە ئیسلام دروستی کردووە. هەر دەرگایەك لەسەر مزگەوتەکەمە دەبێت دابخرێت جگە لە دەرگای ئەبوبەکر)).

## چیرۆکی سی و دوو

## ئیمانداریك لە لێپرسینەوە دەترسێت

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ رضى الله عنه ـ عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ ( كَانَ رَجُلٌ يُسْرِفُ عَلَى نَفْسِهِ، فَلَمَّا حَضَرَهُ الْمَوْتُ قَالَ لِبَنِيهِ إِذَا أَنَا مُتُّ فَأَحْرِقُونِي ثُمَّ اطْحَنُونِي ثُمَّ ذَرُّونِي فِي الرِّيحِ، فَوَاللَّهِ لَئِنْ قَدَرَ عَلَىَّ رَبِّي لَيُعَذِّبَنِّي عَذَابًا مَا عَذَّبَهُ أَحَدًا. فَلَمَّا مَاتَ فُعِلَ بِهِ ذَلِكَ، فَأَمَرَ اللَّهُ الأَرْضَ، فَقَالَ اجْمَعِي مَا فِيكِ مِنْهُ. فَفَعَلَتْ فَإِذَا هُوَ قَائِمٌ، فَقَالَ مَا حَمَلَكَ عَلَى مَا صَنَعْتَ قَالَ يَا رَبِّ، خَشْيَتُكَ. فَغَفَرَ لَهُ (وَقَالَ غَيْرُهُ مَخَافَتُكَ يَا رَبِّ ). (البخاري/٣٤٨١)**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەر (ﷺ) دەگێڕێتەوە، دەفەرموێت:

((کابرایەك هەبوو زۆر زیادە ڕەوی لە گوناهدا کردوو (ستەمی) لە خۆی کرد، کاتێ کەوتە سەرەمەرگ بە منداڵەکانی ووت: ئەگەر من مردم بم سوتێنن و بم هاڕن و بم دەن بە دەم ڕەشەباوە، چونکە سوێند بەخوا ئەگەر پەروەردگارم بتوانێ زیندوم بکاتەوە بە جۆرێك سزام دەدات سزای کەسی نەدابێت، جا کاتێ مرد، وایان لێ کرد. خوای گەورەش فەرمانی دا بە زەوی: هەموو خانەکانی لەشی ئەو کابرایەم بۆ کۆبکەرەوە. زەویش کۆی کردەوە و کتوپڕ کابرا

هەستایە سەر پێ، خوای گەورە فەرمووی: چی پاڵی پێوە نایت وا بكەیت؟ ووتی: ترسی تۆ پەروەردگارم.
خوای گەورەش لێی خۆش بوو.

## چیرۆكی سی و سێ

## خۆ بەكەم زانین لە ئاستی هەژاران دا

**عَنْ أَنَسِ بْنِ مَالِك، أَنَّ جَدَّتَهُ، مُلَيْكَةَ دَعَتْ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ لِطَعَامٍ صَنَعَتْهُ لَهُ، فَأَكَلَ مِنْهُ ثُمَّ قَالَ ( قُومُوا فَلأُصَلِّ لَكُمْ ) . قَالَ أَنَسٌ فَقُمْتُ إِلَى حَصِيرٍ لَنَا قَدِ اسْوَدَّ مِنْ طُولِ مَا لُبِسَ، فَنَضَحْتُهُ بِمَاءٍ، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَصَفَفْتُ وَالْيَتِيمَ وَرَاءَهُ، وَالْعَجُوزُ مِنْ وَرَائِنَا، فَصَلَّى لَنَا رَسُولُ اللَّهِ ﷺ رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ انْصَرَفَ. ( البخاري/٣٨٠ )**

ئەنەسی كوڕی مالیك (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە:
كە (مەلیكە)ی نەنكی دەعوەتێكی خواردنی سازكرد بۆ پێغەمبەر (ﷺ) ئەویش تەشریفی هێنا و دوای نان خواردن فەرمووی:((هەستن با نوێژێك بكەین پێكەوە)).
ئەنەس دەفەرموێت: منیش هەستام حەسیرێكمان هەبوو هێندە بەكار هێنرابوو ڕەش بووبوەوە، ئاوم پیا كرد و پاكم كردەوە.
پێغەمبەر (ﷺ) هەستا و من و منداڵە هەتیوەكە لە پشتەوە ڕیزمان بەست و پیرەژنەكەش لەدوامانەوە. پێغەمبەر (ﷺ) دوو ڕكاتی بۆ كردین و پاشان تەشریفی برد بۆ ماڵەوە.

# چیرۆكی سی و چوار
## بەسەرهاتی بەڵەك و كوێر و كەچەڵەكە

عن اَبي هُرَيْرَةَ (رضی الله عنه)، حَدَّثَهُ اَنَّهُ، سَمعَ رَسُولَ اللّه ﷺ يَقُولُ ( انَّ ثلاَثَةً في بَني اسْرائيلَ ابْرص وَاَقْرَعَ وَاَعْمَى بَدا للّه عز وجل اَنْ يَبْتَليَهُمْ، فَبَعَثَ اليهمْ مَلَكًا، فَاَتى الأبْرَصَ. فَقَال اَيُّ شَيْءٍ اَحَبُّ اليْكَ قَالَ لَوْنٌ حَسَنٌ وَجِلْدٌ حَسَنٌ، قَدْ قَذرَني النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ، فَذَهَبَ عَنْهُ، فَأُعْطِيَ لَوْنًا حَسَنًا وَجِلْدًا حَسَنًا. فَقَالَ اَيُّ المَالِ اَحَبُّ اليْكَ قَالَ الإبلُ - اَوْ قَالَ البَقَرُ هُوَ شَكَّ في ذلكَ، انَّ الأبْرَصَ وَالأقْرَعَ، قَالَ اَحَدُهُمَا الإبلُ، وَقَالَ الآخَرُ البَقَرُ - فَأُعْطِيَ نَاقَةً عُشَرَاءَ. فَقَال يُبَارَكُ لَكَ فيهَا. وَاَتى الأقْرَعَ فَقَالَ اَيُّ شَيْءٍ اَحَبُّ اليْكَ قَالَ شَعَرٌ حَسَنٌ، وَيَذْهَبُ عَنّي هَذَا، قَدْ قَذرَني النَّاسُ. قَالَ فَمَسَحَهُ فَذَهَبَ، وَاُعْطيَ شَعَرًا حَسَنًا. قَالَ فَاَيُّ المَالِ اَحَبُّ اليْكَ قَالَ البَقَرُ. قَالَ فَاَعْطَاهُ بَقَرَةً حَاملاً، وَقَالَ يُبَارَكُ لَكَ فيهَا. وَاَتى الأعْمَى فَقَالَ اَيُّ شَيْءٍ اَحَبُّ اليْكَ قَالَ يَرُدُّ اللّهُ اليَّ بَصَري، فَاُبْصرُ به النَّاسَ. قَالَ فَمَسَحَهُ، فَرَدَّ اللّهُ اليْه بَصَرَهُ. قَالَ فَاَيُّ المَالِ اَحَبُّ اليْكَ قَالَ الغَنَمُ. فَاَعْطَاهُ شَاةً وَالدًا، فَأُنْتجَ هذَان، وَوَلَّدَ هَذَا، فَكَانَ لهَذَا وَادٍ منْ ابلٍ، ولهَذَا وَادٍ منْ بَقَرٍ، وَلهَذَا وَادٍ منَ الغَنَم. ثُمَّ انَّهُ اَتى الأبْرَصَ في صُورَته وَهَيْئَته فَقَالَ رَجُلٌ مسْكينٌ، تَقَطَّعَتْ بيَ الحبَالُ في سَفَري، فَلاَ بَلاَغَ اليَوْمَ الاَّ باللّه ثُمَّ بكَ، اَسْاَلُكَ بالَّذي اَعْطَاكَ اللَّوْنَ الحَسَنَ وَالجلْدَ الحَسَنَ وَالمَالَ بَعيرًا اَتَبَلَّغُ عَلَيْه في سَفَري. فَقَالَ لَهُ انَّ الحُقُوقَ كَثيرَةٌ. فَقَالَ لَهُ كَاَنّي اَعْرفُكَ، اَلَمْ تَكُنْ اَبْرَصَ يَقْذَرُكَ النَّاسُ فَقيرًا فَاَعْطَاكَ اللّهُ فَقَالَ لَقَدْ وَرثْتُ لكَابرٍ عَنْ كَابرٍ. فَقَالَ انْ كُنْتَ كَاذبًا فَصَيَّرَكَ اللّهُ الَى مَا كُنْتَ، وَاَتى الأقْرَعَ في صُورَته وَهَيْئَته، فَقَالَ لَهُ مثْلَ مَا قَالَ لهَذَا، فَرَدَّ عَلَيْه مثْلَ مَا رَدَّ عَلَيْه هَذَا فَقَالَ انْ كُنْتَ كَاذبًا فَصَيَّرَكَ اللّهُ الَى مَا كُنْتَ. وَاَتى الأعْمَى في صُورَته فَقَالَ رَجُلٌ مسْكينٌ وَابْنُ سَبيلٍ وَتَقَطَّعَتْ بيَ الحبَالُ في سَفَري، فَلاَ بَلاَغَ اليَوْمَ الاَّ باللّه، ثُمَّ بكَ اَسْاَلُكَ بالَّذي رَدَّ عَلَيْكَ بَصَرَكَ شَاةً اَتَبَلَّغُ بهَا في سَفَري. فَقَالَ قَدْ كُنْتُ اَعْمَى فَرَدَّ اللّهُ بَصَري، وَفَقيرًا فَقَدْ اَغْنَاني، فَخُذْ مَا شئْتَ، فَوَاللّه لاَ اَجْهَدُكَ اليَوْمَ بشَيْءٍ اَخَذْتَهُ للّه. فَقَالَ اَمْسكْ مَالَكَ، فَانَّمَا ابْتُليتُمْ، فَقَدْ رَضيَ اللّهُ عَنْكَ وَسَخطَ عَلَى صَاحبَيْكَ ). (البخاري)

ئه‌بو هوره‌یره‌(خوای لیّ ڕازی بیّت) ده‌گیّڕیّته‌وه‌ كه‌ له‌ پیّغه‌مبه‌ری (ﷺ) بیستووه‌ فه‌رمویه‌تی: (( سیّ كه‌س له‌ به‌نی ئیسرائیل، به‌ڵه‌كیّك و كه‌چه‌ڵیّك و كویّریّك، خوای گه‌وره‌ لاشه‌ی هه‌ریه‌كه‌یانی توشی ده‌ردیّك كردووه‌، فریشته‌یه‌ك ده‌نیّریّته‌ لایان دیّته‌ لای كابرای به‌ڵه‌ك و لیّی ده‌پرسیّ: له‌ هه‌موو شتیّك زیاتر چیت پیّ خۆشه‌؟ ووتی: ڕه‌نگیّكی جوان و پیّستیّكی جوان چونكه‌ خه‌ڵكی قیزی لیّ ده‌كه‌نه‌وه‌. فریشته‌كه‌ ده‌ستیّكی به‌سه‌ر له‌شیدا هیّنا و به‌ فه‌رمانی خوا چاك بووه‌وه‌ و ڕه‌نگیّكی جوان و پیّستیّكی جوانی پیّ به‌خشرا، پاشان لیّی پرسی: ئه‌ی چ ماڵ و سامانیّكت به‌لاوه‌ خۆشه‌ویسته‌؟ ووتی: ووشتر، یان ووتی: مانگا (ڕاویی گومانی هه‌بوو). ئه‌وه‌بوو به‌ڵه‌كه‌كه‌و كه‌چه‌ڵه‌كه‌ یه‌كێكیان داوای ووشتری كرد و ئه‌وی تریان داوای مانگای كرد. ئه‌وه‌بوو ووشتریّكی سك پڕی پیّ دا كه‌ سكه‌كه‌ی له‌ مانگی ده‌یه‌میدا بوو، له‌ خوایش داوای به‌ره‌كه‌تی بۆ كرد. پاشان هاته‌ لای كه‌چه‌ڵه‌كه‌ و ووتی: له‌ هه‌موو شتیّ زیاتر چییت پیّ خۆشه‌؟ ووتی: قژیّكی جوان و ئه‌م كه‌چه‌ڵیه‌ی نه‌میّنیّ، چونكه‌ خوڵكی قیّزی لیّ ده‌كه‌نه‌وه‌ فریشته‌كه‌ ده‌ستیّكی به‌سه‌ردا هیّنا و (به‌ فه‌رمانی خوا) چاك بوه‌وه‌ و، قژیّكی جوانی پیّ به‌خشرا. پاشان لیّی پرسی: ئه‌ی چ ماڵ و سامانیّكت به‌لاوه‌ خۆشه‌ویسته‌؟ ووتی: مانگا ئه‌وه‌بوو مانگایه‌كی ئاوسی پیّ داو، له‌ خوایش داوای به‌ره‌كه‌تی بۆ كرد. پاشان هاته‌ لای پیاوه‌ كویّره‌كه‌ ووتی: له‌ هه‌موو شتیّ زیاتر چییت پیّ خۆشه‌؟ ووتی: خوای گه‌وره‌ چاوه‌كانم پیّ ببه‌خشیّته‌وه‌، فریشته‌كه‌ ده‌ستی به‌سه‌ردا هیّنا و خوای گه‌وره‌ بینای پیّ به‌خشیه‌وه‌، پاشان لیّی پرسی: ئه‌ی چ ماڵ و سامانیّكت به‌لاوه‌ خۆشه‌ویسته‌؟ ووتی: مه‌ڕ، ئه‌ویش مه‌ڕیّكی سك پڕی پیّدا. (به‌فه‌رمانی خوا) ووشتر و مانگا و مه‌ڕه‌كه‌ كه‌وتنه‌ زاوزیّ، ئه‌میان بووه‌ خاوه‌نی یه‌ك شیو ووشتر ئه‌ویان پڕی یه‌ك شیو مانگا و ئه‌وی تریان پڕی یه‌ك شیو مه‌ڕی هه‌بوو. پاشان فریشته‌كه‌ به‌ هه‌مان شیّوه‌ هاته‌ لای به‌ڵه‌كه‌كه‌ ووتی: پیاویّكی هه‌ژاره‌ و له‌شویّنیّكی دووره‌وه‌ هاتووه‌ و پاره‌ و پولی لیّ براوه‌ و په‌نای خوایه‌ پاشان تۆ. جا له‌به‌ر خاتری ئه‌و خوایه‌ی كه‌ ئه‌م ڕه‌نگه‌ جوانه‌ و ئه‌م پیّسته‌ جوانه‌ و ئه‌م ماڵ و سامانه‌ی پیّ به‌خشیویت ووشتریّكم پیّ بده‌ تا سواری ببم و بم گه‌یه‌نیّته‌ جیّی خۆم له‌م گه‌شته‌مدا. ووتی:(كاكه‌ !) ئیّمه‌ زۆرمان له‌ ئه‌ستۆدایه‌، ئه‌ویش پیّی ووت: وابزانم من تۆ ده‌ناسم، تۆ پیاویّكی به‌ڵه‌كی نه‌خۆش نه‌بوویت  كه‌ خه‌ڵكیی قیّزیان لیّ ده‌كردیته‌وه‌، هه‌ژار نه‌بوویت خوا پیّی به‌خشیت؟ ووتی: ئه‌م ماڵ و سامانه‌ پشتا و پشت بۆم ماوه‌ته‌وه‌. فریشته‌كه‌ ووتی: ئه‌گه‌ر

درۆزن بیت خوا وەكو خۆتت لیّ بكاتەوە. پاشان فریشتەكە لە شێوەی جاری یەكەم دا چوو بۆ لای كابرای كەچەڵ و هەمان شتی پیّ ووت: ئەویش هەمان وەلامی ئەوی دایەوە. فریشتەكە دووعای لیّكرد و ووتی: ئەگەر درۆزن بیت خوا وەكو خۆتت لیّ بكاتەوە. پاشان لەشێوەی جاری یەكەم دا چوو بۆلای ئەو پیاوەی جاران كوێر بوو ووتی: پیاوێكی هەژارم و رێبوارێكی دەست كورتم كە لە سەفەردا پارە و پولم لیّ براوە، مەگەر خوای گەورە پاشان تۆ فریام بكەویت. داوات لیّ دەكەم لەبەر خاتری ئەو خوایەی كە چاوەكانتی چاك كردنەوە مەڕێكم پیّ بدەی هەتا پێی بگەمەوە ماڵەوە. ئەویش ووتی: من پیاوێكی كوێر بووم خوای گەورە چاوەكانمی پیّ بەخشیمەوە هەژار بووم خوای گەورە دەوڵەمەندی كردم، لەناو ئەو مەڕ و ماڵاتەدا چیت پیّ خۆشە هەڵی بژێرە، دە بەخوا هەرچی هەڵبژێری لەبەر ڕەزامەندی خوا دەست بە ڕووتەوە نانێم. فریشتەكەش لە وەلامدا ووتی: سەروەت و سامانی خۆت بۆ خۆت، ئەمە بەڵكو تاقیكردنەوەیەك بوو بۆتان (هەر سێكتان) جا خوای گەورە لە تۆ ڕازی بوو، بەلام لە هەردوو هاوەڵەكەت ڕەنجا)).

## چیرۆكی سی و پێنج

## بەرەكەتی ماڵ و منداڵی ئەبو بەكر (خوای لیّ ڕازی بێت)

**عَنْ عَائِشَةَ، زَوْجِ النَّبِيِّ صلى الله عليه وسلم قَالَتْ خَرَجْنَا مَعَ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم فِي بَعْضِ أَسْفَارِهِ، حَتَّى إِذَا كُنَّا بِالْبَيْدَاءِ ـ أَوْ بِذَاتِ الْجَيْشِ ـ انْقَطَعَ عِقْدٌ لِي، فَأَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَلَى الْتِمَاسِهِ، وَأَقَامَ النَّاسُ مَعَهُ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، فَأَتَى النَّاسُ إِلَى أَبِي بَكْرٍ الصِّدِّيقِ فَقَالُوا أَلاَ تَرَى مَا صَنَعَتْ عَائِشَةُ أَقَامَتْ بِرَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَالنَّاسِ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ. فَجَاءَ أَبُو بَكْرٍ وَرَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَاضِعٌ رَأْسَهُ عَلَى فَخِذِي قَدْ نَامَ فَقَالَ حَبَسْتِ رَسُولَ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَالنَّاسَ، وَلَيْسُوا عَلَى مَاءٍ، وَلَيْسَ مَعَهُمْ مَاءٌ. فَقَالَتْ عَائِشَةُ فَعَاتَبَنِي أَبُو بَكْرٍ، وَقَالَ مَا شَاءَ اللَّهُ أَنْ يَقُولَ، وَجَعَلَ يَطْعُنُنِي بِيَدِهِ فِي خَاصِرَتِي، فَلاَ يَمْنَعُنِي مِنَ التَّحَرُّكِ إِلاَّ مَكَانُ رَسُولِ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم عَلَى فَخِذِي، فَقَامَ رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم حِينَ أَصْبَحَ عَلَى غَيْرِ مَاءٍ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ التَّيَمُّمِ فَتَيَمَّمُوا. فَقَالَ**

**أُسَيْدُ بْنُ الْحُضَيْرِ ما هِيَ بِأَوَّلِ بَـرَكَتِكُمْ يَـا آلَ أَبِـي بَكْـرٍ. قَـالَـتْ فَبَعَثْنَـا الْـبَعِيرَ الَّـذِي كُنْـتُ عَلَيْـهِ، فَأَصَبْنَا الْعِقْدَ تَحْتَهُ**.( البخاري/٣٣٤ )

خاتوو عائیشەی خێزانی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

لەگەڵ پێغەمبەری خوادا (ﷺ) لە یەكێ لە گەشتەكانیدا دەرچووین هەتا كاتێ گەیشتینە (بەیدا)[1] یان (ذات الجیش)[2] ملوانكەكەم پچڕا، ئیتر پێغەمبەری خوا و خەڵكەكەش لەگەڵی كەوتنە گەڕان بەشوێنیدا، شوێنەكەش ئاوی لێ نەبوو. خەڵكیش دوای ئەوە هاتن بۆ لای ئەبو بەكری سدیق (خوای لێ ڕازی بێت) ووتیان: نابینی عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) چی كرد چۆن پێغەمبەری خوا و خەڵكەكەی لێرەدا گیرداوە و ئاویشیان پێ نیە و ئاویشی لێ نیە، لەو كاتەدا پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەری لەسەر ڕانم دانا بوو خەویشی لێ كەوتبوو ئەبو بەكر هات و فەرمووی: پێغەمبەری خوا و (ﷺ) خەڵكەكەت لێرەدا گیرداوە و ئاویشی لێ نیە و ئاویشیان پێ نیە. عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەبو بەكر گلەیی لێ كردم و مەگەر خوا بزانێ چی پێ ووتم سیخورمەشی دەكوتایە كەلەكەم، منیش لەبەر ئەوەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) لەسەر ڕانم بوو نەدەجوڵام. ئینجا پێغەمبەری خوا (ﷺ) كە ڕۆژی لێ بووەوە بەبێ ئاو، خوای گەورە ئایەتی تەیەمومی دابەزاند، خەڵكیش بە تەیەموم نوێژیان كرد، ئوسەیدی كوڕی حوضەیر (خوای لێ ڕازی بێت) فەرمووی: ئەی بنەماڵە و ئال و بەیتی ئەبو بەكر ئەمە یەكەم پیت و بەرەكەتی ئێوە نیە!. خاتو عائیشە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: پاشان ئەو ووشترەی منی لەسەر بووم هەڵمان ساند بینیمان ملوانكەكە لە ژێریدایە.

(١) (٢) دوو شوێنی نزیكن لە یەكتر و لە لای مەدینەوەن لەسەر ڕێگای مەككە. الفتح الباری بەرگی (١) لاپەڕە / ٥٧٥)

## چیرۆكی سی و شەش

## چیرۆكی شارە مێرووله

**عن أَبِي هُرَيْرَةَ ( رضى الله عنه ) قَالَ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ ( قَرَصَتْ نَمْلَةٌ نَبِيًّا مِنَ الأَنْبِيَاءِ، فَأَمَرَ بِقَرْيَةِ النَّمْلِ فَأُحْرِقَتْ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَيْهِ أَنْ قَرَصَتْكَ نَمْلَةٌ أَحْرَقْتَ أُمَّةً مِنَ الأُمَمِ تُسَبِّحُ ) . ( البخاري/٣٠١٩-٣٣١٩ )**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە كە لە پێغەمبەری (ﷺ)بیستووە فەرمویەتی:((پێغەمبەریك لە پێغەمبەرانی خوا مێرووله‌یەك دەیگەزێت، ئەویش داوادەكات شارە مێروولەكە بسووتێنن، ئەوانیش دەیسووتێنن. خوای گەورەش وەحی بۆنارد كە یەك مێرووله تۆی گەست كەچی یەك ئوممەتت لەئوممەتەكان سوتاند كە تەسبیحاتی خوایان دەكرد)). لە ڕیوایەتێكی تردا هاتووە:((پێغەمبەرێك لە پێغەمبەران لە ژێر درەختێكدا لای دا، مێروولەیەك گەستی ئەویش فەرمانی دا كەل و پەلەكەی لە ژێر درەختەكەدا لابەرن پاشان فەرمانی دا شارە مێروولەكە بسووتێنن، خوای گەورەش وەحی بۆنارد كەدەبوو تەنها ئەو مێروولەیەی بكوشتایە)).

## چیرۆكی سی و حەوت

## خانوو بەرەو گەنجینە

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ( رضى الله عنه ) قَالَ النَّبِيُّ ﷺ ( اشْتَرَى رَجُلٌ مِنْ رَجُلٍ عَقَارًا لَهُ، فَوَجَدَ الرَّجُلُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ فِي عَقَارِهِ جَرَّةً فِيهَا ذَهَبٌ، فَقَالَ لَهُ الَّذِي اشْتَرَى الْعَقَارَ خُذْ ذَهَبَكَ مِنِّي، إِنَّمَا اشْتَرَيْتُ مِنْكَ الأَرْضَ، وَلَمْ أَبْتَعْ مِنْكَ الذَّهَبَ. وَقَالَ الَّذِي لَهُ الأَرْضُ إِنَّمَا بِعْتُكَ الأَرْضَ وَمَا فِيهَا، فَتَحَاكَمَا إِلَى رَجُلٍ، فَقَالَ الَّذِي تَحَاكَمَا إِلَيْهِ أَلَكُمَا وَلَدٌ قَالَ أَحَدُهُمَا لِي غُلاَمٌ. وَقَالَ الآخَرُ لِي جَارِيَةٌ. قَالَ أَنْكِحُوا الْغُلاَمَ الْجَارِيَةَ، وَأَنْفِقُوا عَلَى أَنْفُسِهِمَا مِنْهُ، وَتَصَدَّقَا ). ( البخاري/٣٤٧٢ )**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:
پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:((پیاوێك خانووی لە پیاوێكی تر كڕی جا ئەو پیاوەی خانووەكەی كڕی لەناو خانووەكەدا كوپەیەكی دۆزییەوە ئاڵتونی تیابوو، بەكابرای تری ووت: ئاڵتونەكەتم لێ وەربگرەوە، چونكە من زەوییەكەم لێ كڕیویت، ئاڵتونەكەم لێ نەكڕیویت. ئەوەی تریش كە خاوەنی زەویەكە بوو ووتی: من زەویەكەم پێ فرۆشتووت لەگەڵ شتەكانی ناویدا. سەرەنجام داوەری یەكەیان بردە لای كابرایەك. ئەویش ووتی پێ یان: ئێوە منداڵتان هەیە یەكێكیان ووتی: من كوڕێكم هەیە، ئەوی تریشیان ووتی: منیش كچێكم هەیە، ووتی: ئەو كچە مارە بكەن لەو كوڕە و لەو ئاڵتونە بۆیان سەرف بكەن و ئەوی تری بكەن بە خێر)).

## چیرۆكی سی و هەشت

## ئیماندار پیس نابێت

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، قَالَ لَقِيَنِي رَسُولُ اللَّهِ صلى الله عليه وسلم وَأَنَا جُنُبٌ، فَأَخَذَ بِيَدِي، فَمَشَيْتُ مَعَهُ حَتَّى قَعَدَ فَانْسَلَلْتُ، فَأَتَيْتُ الرَّحْلَ، فَاغْتَسَلْتُ ثُمَّ جِئْتُ وَهُوَ قَاعِدٌ فَقَالَ ( أَيْنَ كُنْتَ يَا أَبَا هِرٍّ ) فَقُلْتُ لَهُ. فَقَالَ ( سُبْحَانَ اللَّهِ يَا أَبَا هِرٍّ إِنَّ الْمُؤْمِنَ لاَ يَنْجُسُ ). ( البخاري/٢٨٥ )**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:
بە خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتم بە لەشی پیسەوە، ئەویش دەستی گرتم و ماوەیەك لەگەڵی ڕۆیشتم تا دانیشت، منیش خۆم لێ دزیەوە و چوومەوە بۆ ماڵەوە خۆم شۆرد و پاشان هاتمەوە ئەو هەر دانیشتبوو، فەرمووی: ئەبو هورەیرە لەكوێ بویت؟ منیش بۆم گێڕایەوە. ئەویش فەرمووی:((سبحان الله، ئەی ئەبو هیڕ ئیماندار پیس نابێت)).

## چیرۆكی سی و نۆ

## چاكەكردن لەگەڵ ژندا ئەگەرچی لەحەیزدابێت

**عَنْ زَيْنَبَ ابْنَتِ أَبِي سَلَمَةَ، حَدَّثَتْهُ أَنَّ أُمَّ سَلَمَةَ قَالَتْ حِضْتُ وَأَنَا مَعَ النَّبِيِّ ﷺ فِي الْخَمِيلَةِ [1]، فَانْسَلَلْتُ فَخَرَجْتُ مِنْهَا، فَأَخَذْتُ ثِيَابَ حِيضَتِي فَلَبِسْتُهَا، فَقَالَ لِي رَسُولُ اللَّهِ ﷺ أَنُفِسْتِ. قُلْتُ نَعَمْ، فَدَعَانِي فَأَدْخَلَنِي مَعَهُ فِي الْخَمِيلَةِ. قَالَتْ وَحَدَّثَتْنِي أَنَّ النَّبِيَّ ﷺ كَانَ يُقَبِّلُهَا وَهُوَ صَائِمٌ، وَكُنْتُ أَغْتَسِلُ أَنَا وَالنَّبِيُّ ﷺ مِنْ إِنَاءٍ وَاحِدٍ مِنَ الْجَنَابَةِ. (البخاري/٣٢٢)**

زەینەبی كچی ئەبو سەلەمە دەگێڕێتەوە كە ئوم سەلەمە (خوای لێ ڕازی بێت) فەرموویەتی: لەگەڵ پێغەمبەردا بوم (ﷺ) لەناو عەباكەدا، كەوتمە حەیزەوە، منیش بە ئەسپایی هاتمە دەرەوە و چووم پۆشاكی حەیزم لەبەركرد، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی:((ئایا كەوتیتە حەیزەوە ؟)) ووتم: بەڵێ، ئەویش بانگی كردم و بردمیە ناو عەباكەوە. دەفەرموێت: ئوم سەلەمە هەروەها دەیفەرموو كەپێغەمبەر (ﷺ) بەرۆژوو بووە و ماچیشی كردووە، وەمن و پێغەمبەر (ﷺ) لەیەك دەفردا خۆمان دەشۆرد و لەش گرانیمان دەردەكرد.

## چیرۆكی چل

## گایەك و گورگێك قسەدەكەن

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ رضى الله عنه ـ قَالَ صَلَّى رَسُولُ اللَّهِ ﷺ صَلاَةَ الصُّبْحِ، ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى النَّاسِ، فَقَالَ ( بَيْنَا رَجُلٌ يَسُوقُ بَقَرَةً إِذْ رَكِبَهَا فَضَرَبَهَا فَقَالَتْ إِنَّا لَمْ نُخْلَقْ لِهَذَا، إِنَّمَا خُلِقْنَا لِلْحَرْثِ فَقَالَ النَّاسُ سُبْحَانَ اللَّهِ بَقَرَةٌ تَكَلَّمُ. فَقَالَ فَإِنِّي أُومِنُ بِهَذَا أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ ـ وَمَا هُمَا ثَمَّ ـ وَبَيْنَمَا**

(١) الخميلە: كە لەم فەرموودەیەدا هاتووە لە (مختار الصحاح) دا دەڵێت سەختێكە كە كڵكراوە و چڕ بێت.

لە (فتح الباري) دا لە بەرگی (١) لاپەڕە ٥٢٥ دەڵێت : بریتی یە لە عەبایەكی ڕەش كە ڕیشوەی هەبێت لە خوری.

**رَجُلٌ فِي غَنَمِهِ إذْ عَدَا الذِّئْبُ فَذَهَبَ مِنْهَا بِشَاةٍ، فَطَلَبَ حَتَّى كَأنَّهُ اسْتَنْقَذَهَا مِنْهُ، فَقَالَ لَهُ الذِّئْبُ هَذَا اسْتَنْقَذْتَهَا مِنِّي فَمَنْ لَهَا يَوْمَ السَّبُعِ، يَوْمَ لاَ رَاعِيَ لَهَا غَيْرِي. فَقَالَ النَّاسُ سُبْحَانَ اللَّهِ ذِئْبٌ يَتَكَلَّمُ. قَالَ ( فَإِنِّي أُومِنُ بِهَذَا أَنَا وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ وَمَا هُمَا ثَمَّ ). (البخاري/٣٤٧١)**

ئەبو هورەیرە(خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:
پێغەمبەری خوا (ﷺ) نوێژی بەیانی کرد و ڕووی کردە خەڵکەکە و فەرمووی:((لەکاتێکدا پیاوێك گایەکی دا بووە بەرو لێ ی دەخوڕی کتوپڕ سواری پشتی بوو وە دەستی کردە لێدانی گاکەش وتی:ئێمە بۆ ئەمە دروست نەکراوین بەڵکو بۆ جووت کردن دروست کراوین)) خەڵکەکەش وتیان: سُبحان الله گا قسەدەکات؟ فەرمووی:((من و ئەبو بەکر و عومەر باوەڕمان بەوە هەیە)) ئەبو بەکر و عومەریش لەوێ نەبوون. هەروەها لەکاتێکدا پیاوێك لەناو ڕانە مەڕەکەیدا بوو کتوپڕ گورگێك پەیدا بوو بەرخێکی پێش خۆی دا. شوانەکەش کەوتە شوێنی تا ڕزگاری کرد لەدەستی گورگەکە. گورگەکە بەشوانەی ووت: ئەوا تۆ لەدەستی من ڕزگارت کرد، ئەی لە ڕۆژی دڕندە کێ ڕزگاری دەکات، ئەو ڕۆژەی شوانی نیە جگە لە من)). خەڵکەکەش وتیان: سُبحان الله گورگ قسەدەکات؟ فەرمووی: ((من و ئەبو بەکر و عومەر باوەڕمان بەوە هەیە))
ئەوانیش لەو کاتەدا لەوێ نەبوون.

## چیرۆکی چل و یەك

## بۆچوونەکانی عومەر(خوای لێ ڕازی بێت) موافیقی ویستی خوایە

**عَنْ عَائِشَةَ، أَنَّ أَزْوَاجَ النَّبِيِّ ﷺ كُنَّ يَخْرُجْنَ بِاللَّيْلِ إِذَا تَبَرَّزْنَ إِلَى الْمَنَاصِعِ ـ وَهُوَ صَعِيدٌ أَفْيَحُ ـ فَكَانَ عُمَرُ يَقُولُ لِلنَّبِيِّ ﷺ احْجُبْ نِسَاءَكَ. فَلَمْ يَكُنْ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَفْعَلُ، فَخَرَجَتْ سَوْدَةُ بِنْتُ زَمْعَةَ زَوْجُ النَّبِيِّ ﷺ لَيْلَةً مِنَ اللَّيَالِي عِشَاءً، وَكَانَتِ امْرَأَةً طَوِيلَةً، فَنَادَاهَا عُمَرُ أَلاَ قَدْ عَرَفْنَاكِ يَا سَوْدَةُ. حِرْصًا عَلَى أَنْ يَنْزِلَ الْحِجَابُ، فَأَنْزَلَ اللَّهُ آيَةَ الْحِجَابِ. (البخاري/١٤٦)**

دایکمان عائیشه (خوای لیّ ڕازی بیّت) ده‌فه‌رمویّت:
خیّزانه‌کانی پیّغه‌مبه‌ر (ﷺ) به‌شه‌ودا ده‌رده‌چوون بۆ ده‌ست به‌ئاو گه‌یاندن بۆ ((مناصع)) ( که شویّنیّکی فراوان بووه له نزیك به‌قیعه‌وه). (حه‌زره‌تی) عومه‌ریش چه‌ندجاریّك بوو ده‌یفه‌رموو به پیّغه‌مبه‌ر (ﷺ): ڕیّ له هاوسه‌رانت بگره با له‌مالّ ده‌رنه‌چن، یان با حیجاب بپۆشن، پیّغه‌مبه‌ری خواش (ﷺ) وای نه‌ده‌کرد، شه‌ویّك له‌شه‌وان سه‌وده‌ی کچی زه‌معه‌ی هاوسه‌ری پیّغه‌مبه‌ر (ﷺ) هاته‌ده‌ره‌وه له‌مالّ که ئافره‌تیّکی بالاّ به‌رز بوو. (حه‌زره‌تی) عومه‌ر بانگی کرد و ووتی: سه‌وده خان ده‌زانین خۆتی. (ئه‌مه‌ش هه‌مووی) سووربوونی عومه‌ری ده‌رده‌خست له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی فه‌رمان به حیجاب دابه‌زیّت، (سه‌ره‌نجام) خوای گه‌وره ئایه‌تی حیجابی دابه‌زاند.

## چیرۆکی چل و دوو

## به‌رائه‌تی حه‌زره‌تی موسا (عليه السلام) له بوختانی به‌نی ئیسرائیل

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ ( كَانَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ يَغْتَسِلُونَ عُرَاةً، يَنْظُرُ بَعْضُهُمْ إِلَى بَعْضٍ، وَكَانَ مُوسَى يَغْتَسِلُ وَحْدَهُ، فَقَالُوا وَاللَّهِ مَا يَمْنَعُ مُوسَى ( عليه سلام ) ) أَنْ يَغْتَسِلَ مَعَنَا إِلاَّ أَنَّهُ آدَرُ، فَذَهَبَ مَرَّةً يَغْتَسِلُ، فَوَضَعَ ثَوْبَهُ عَلَى حَجَرٍ، فَفَرَّ الْحَجَرُ بِثَوْبِهِ، فَخَرَجَ مُوسَى فِي إِثْرِهِ يَقُولُ ثَوْبِي يَا حَجَرُ. حَتَّى نَظَرَتْ بَنُو إِسْرَائِيلَ إِلَى مُوسَى، فَقَالُوا وَاللَّهِ مَا بِمُوسَى مِنْ بَأْسٍ. وَأَخَذَ ثَوْبَهُ، فَطَفِقَ بِالْحَجَرِ ضَرْبًا ( فَقَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ وَاللَّهِ إِنَّهُ لَنَدَبٌ بِالْحَجَرِ سِتَّةٌ أَوْ سَبْعَةٌ ضَرْبًا بِالْحَجَرِ ).**
**( البخاري/٢٧٨ )**

ئه‌بو هوره‌یره له پیّغه‌مبه‌ره‌وه (ﷺ) ده‌گیّڕیّته‌وه ده‌فه‌رمویّت:((نه‌وه‌ی ئیسرائیل به ڕووتی خۆیان ده‌شۆرد و ته‌ماشای یه‌کتریان ده‌کرد، موساش (عليه السلام) به‌ته‌نیا خۆی ده‌شت، (له‌ناو خۆیاندا) ووتیان: موسا قۆڕه بۆیه له‌گه‌لّ ئیّمه‌دا خۆی ناشوات. بۆیه جاریّکیان ڕۆیشت خۆی بشوات، جل و به‌رگه‌که‌ی له‌سه‌ر به‌ردیّك دانا و کتوپڕ به‌رده‌که جله‌کانی ڕفاند و که‌وته ڕاکردن، موساش که‌وته شویّنی و ده‌یووت به‌رده‌که جله‌کانم (تا گه‌یشته ناو خه‌لّکی) و به‌نی ئیسرائیل

ته‌ماشای موسایان كرد و ووتیان: سوێند به‌خوا موسا عه‌یبی نییه. ئه‌ویش جله‌كانی هه‌ڵگرته‌وه و ده‌ستی كرده لێدانی به‌رده‌كه)).

ئه‌بو هوره‌یره ده‌فه‌رموێت : سوێند به‌خوائه‌و به‌رده چه‌ند شوێنه‌وارێكی لێدانی پێوه بووه له شه‌ش یان حه‌وت جێگه‌دا كه به به‌رد لێ ی دابوو.

## چیرۆكی چل و سێ

## به‌سه‌رهاتی هه‌زار دیناره‌كه

عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ ـ رضى الله عنه ـ عَنْ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ ( أَنَّهُ ذَكَرَ رَجُلاً مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ سَأَلَ بَعْضَ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنْ يُسْلِفَهُ أَلْفَ دِينَارٍ، فَقَالَ ائْتِنِي بِالشُّهَدَاءِ أُشْهِدُهُمْ. فَقَالَ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا. قَالَ فَأْتِنِي بِالْكَفِيلِ. قَالَ كَفَى بِاللَّهِ كَفِيلاً. قَالَ صَدَقْتَ. فَدَفَعَهَا إِلَيْهِ إِلَى أَجَلٍ مُسَمًّى، فَخَرَجَ فِي الْبَحْرِ، فَقَضَى حَاجَتَهُ، ثُمَّ الْتَمَسَ مَرْكَبًا يَرْكَبُهَا، يَقْدَمُ عَلَيْهِ لِلأَجَلِ الَّذِي أَجَّلَهُ، فَلَمْ يَجِدْ مَرْكَبًا، فَأَخَذَ خَشَبَةً، فَنَقَرَهَا فَأَدْخَلَ فِيهَا أَلْفَ دِينَارٍ، وَصَحِيفَةً مِنْهُ إِلَى صَاحِبِهِ، ثُمَّ زَجَّجَ مَوْضِعَهَا، ثُمَّ أَتَى بِهَا إِلَى الْبَحْرِ، فَقَالَ اللَّهُمَّ إِنَّكَ تَعْلَمُ أَنِّي كُنْتُ تَسَلَّفْتُ فُلاَنًا أَلْفَ دِينَارٍ، فَسَأَلَنِي كَفِيلاً، فَقُلْتُ كَفَى بِاللَّهِ كَفِيلاً، فَرَضِيَ بِكَ، وَسَأَلَنِي شَهِيدًا، فَقُلْتُ كَفَى بِاللَّهِ شَهِيدًا، فَرَضِيَ بِكَ، وَأَنِّي جَهَدْتُ أَنْ أَجِدَ مَرْكَبًا، أَبْعَثُ إِلَيْهِ الَّذِي لَهُ فَلَمْ أَقْدِرْ، وَإِنِّي أَسْتَوْدِعُكَهَا. فَرَمَى بِهَا فِي الْبَحْرِ حَتَّى وَلَجَتْ فِيهِ، ثُمَّ انْصَرَفَ، وَهْوَ فِي ذَلِكَ يَلْتَمِسُ مَرْكَبًا، يَخْرُجُ إِلَى بَلَدِهِ، فَخَرَجَ الرَّجُلُ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ، يَنْظُرُ لَعَلَّ مَرْكَبًا قَدْ جَاءَ بِمَالِهِ، فَإِذَا بِالْخَشَبَةِ الَّتِي فِيهَا الْمَالُ، فَأَخَذَهَا لأَهْلِهِ حَطَبًا، فَلَمَّا نَشَرَهَا وَجَدَ الْمَالَ وَالصَّحِيفَةَ، ثُمَّ قَدِمَ الَّذِي كَانَ أَسْلَفَهُ، فَأَتَى بِالأَلْفِ دِينَارٍ، فَقَالَ وَاللَّهِ مَا زِلْتُ جَاهِدًا فِي طَلَبِ مَرْكَبٍ لآتِيَكَ بِمَالِكَ، فَمَا وَجَدْتُ مَرْكَبًا قَبْلَ الَّذِي أَتَيْتُ فِيهِ. قَالَ هَلْ كُنْتَ بَعَثْتَ إِلَىَّ بِشَىْءٍ قَالَ أُخْبِرُكَ أَنِّي لَمْ أَجِدْ مَرْكَبًا قَبْلَ الَّذِي جِئْتُ فِيهِ. قَالَ فَإِنَّ اللَّهَ قَدْ أَدَّى عَنْكَ الَّذِي بَعَثْتَ فِي الْخَشَبَةِ فَانْصَرِفْ بِالأَلْفِ الدِّينَارِ رَاشِدًا ).

ئه‌بو هوره‌یره (خوای لێ ڕازی بێت) له پێغه‌مبه‌ری خواوه (ﷺ) ده‌گێڕێته‌وه:

كە ((پیاوێك لە بەنی ئیسرائیل داوا لە پیاوێكی تری بەنی ئیسرائیل دەكات كە هەزار دینار (واتە هەزار مسقالێ ئالتون) ی بەقەرز بداتیێ، ئەویش ووتی برۆ چەند شاهێدێكم بۆ بێنە، بیان كەم بە شاهید، ووتی: خوا بەسە بۆ شاهێدیی، ووتی: دەی برۆ كەفیلم بۆ بێنە، ووتی: خوا بەسە بۆ كەفیلی، ووتی: ڕاست ئەكەی. ئینجا هەزار دینارەكەی بەقەرز دا پێی تا دوای ماوەیەكی دیاریكراو بۆی بێنێتەوە. پاشان كابرا ناوچەكەی بەجێ هێشت و سواری كەشتی بوو، كارەكەی ئەنجامدا و پاشان ویستی سواری كەشتی بێت و بێتەوە بۆلای (خاوەنی قەرزەكە) و لە كاتی دیایكراودا بگاتەوە ئەوێ. كەچی كەشتی دەست نەكەوت. ئینجا تەختە دارێكی هێنا و هەڵی كۆڵی و هەزار دینارەكە و نامەیەكی تێخست بۆ خاوەن پارە، پاشان شوێنی هەڵكۆڵینەكەی داپۆشیی و هێنای بۆ دەریاكە و ووتی:

ئەی پەروەردگارم. تۆچاك دەزانیی كەوا من هەزار دینارم لە فلان كەس بەقەرز وەرگرت، داوای كەفیلی لێ كردم ووتم:خوا بەسە بۆ كەفیلی، ئەویش بە كە فیلیی تۆ ڕازی بوو، داوای شاهێدیشی لێ كردم،ووتم: خوا بەسە بۆ شاهێدیی، بەوەش ڕازیی بوو. منیش ئەوەتا هەوڵ و تەقالایەكی زۆرم دا و هەرچی لەتواناما بوو بەختم كرد بۆ دەست خستنی كەشتیەك تا ئەو پارەیەی وا بەلامەوە بۆی بنێرم، بەڵام نەمتوانی. (ئەی پەروەردگارم) وا ئەم تەختە دارە ئەسپێرم بە تۆ، (بۆم بگەیەنیت). تەختەداری فڕێ دایە ناو دەریاوە، تا لەناو ئاوەكەدا گوم بوو، ئەمیش گەڕایەوە، لەو كاتەدا كەوتە هەوڵدان تا كەشتییەكی دەست بكەوێ بگەڕێتەوە وولاتی خۆی، پیاوی خاوەن پارەیش لەماڵ دەرچوو تەماشای دەكرد بەشكوم كەشتییەك پەیدا بێت پارەكەی بۆ بێنێتەوە، كتوپڕ تەختە دارەكە كەپارەكەی تیا بوو دەركەوت ئەمیش هێنایەوە بۆ ماڵ تا بیكەنە سوتەمەنی، كە لەتیكرد دەبینێ پارەكە و نامەكەی تێدایە. پاشان پیاوەكەی كە قەرزی لێ وەرگرتبوو پەیدا بوو هەزار دینارەكەی بۆ هێنایەوە و ووتی: سوێند بەخوا تائێستا بەو پەڕی توانامەوە هەوڵم داوە تا كەشتیم دەست بكەوێت و پارەكەت بۆ بهێنمەوە، بەڵام پێش ئەم كەشتییەی پێی هاتمەوە یەك كەشتیم نەدیوە. ووتی: ئایا تۆ لەوە و پێش هیچت بۆ من ناردووە؟ ووتی: من پێت ڕائەگەیەنم پێش ئەم كەشتی یەی من پێی هاتووم كەشتی ترم دەست نەكەوتووە. ووتی: ئەو پارەیەی كە تۆ لەناو تەختەدارەكەدا ناردبووت، خوای گەورە گەیاندی و قەرزەكەی بۆ دایەوە. هەزار دیناری خۆت بۆ خۆت.

# چیرۆكی چل و چوار

## بەسەرهاتی موسا و خضر (عليه السلام)

**عَن ابنِ عَبَّاس، أَنَّهُ تَمَارَى هُوَ وَالحُرُ بْنُ قَيْسِ بْنِ حِصْنِ الفَزَارِيُّ فِي صَاحِبِ مُوسَى قَالَ ابنُ عَبَّاسٍ هُوَ خَضِرٌ. فَمَرَّ بِهِمَا أُبَيُّ بْنُ كَعْبٍ، فَدَعَاهُ ابْنُ عَبَّاسٍ فَقَالَ إِنِّي تَمَارَيْتُ أَنَا وَصَاحِبِي، هَذَا فِي صَاحِبِ مُوسَى الَّذِي سَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَى لُقِيِّهِ، هَلْ سَمِعْتَ النَّبِيَّ صلى الله عليه وسلم يَذْكُرُ شَأْنَهُ قَالَ نَعَمْ سَمِعْتُ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ يَقُولُ ( بَيْنَمَا مُوسَى فِي مَلإٍ مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، جَاءَهُ رَجُلٌ فَقَالَ هَلْ تَعْلَمُ أَحَدًا أَعْلَمَ مِنْكَ قَالَ مُوسَى لاَ. فَأَوْحَى اللَّهُ عز وجل إِلَى مُوسَى بَلَى، عَبْدُنَا خَضِرٌ، فَسَأَلَ مُوسَى السَّبِيلَ إِلَيْهِ، فَجَعَلَ اللَّهُ لَهُ الحُوتَ آيَةً، وَقِيلَ لَهُ إِذَا فَقَدْتَ الحُوتَ فَارْجِعْ، فَإِنَّكَ سَتَلْقَاهُ، وَكَانَ يَتَّبِعُ أَثَرَ الحُوتِ فِي البَحْرِ، فَقَالَ لِمُوسَى فَتَاهُ أَرَأَيْتَ إِذْ أَوَيْنَا إِلَى الصَّخْرَةِ فَإِنِّي نَسِيتُ الحُوتَ، وَمَا أَنْسَانِيهِ إِلاَّ الشَّيْطَانُ أَنْ أَذْكُرَهُ. قَالَ ذَلِكَ مَا كُنَّا نَبْغِي، فَارْتَدَّا عَلَى آثَارِهِمَا قَصَصًا، فَوَجَدَا خَضِرًا. فَكَانَ مِنْ شَأْنِهِمَا الَّذِي قَصَّ اللَّهُ ـ عَزَّ وَجَلَّ ـ فِي كِتَابِهِ ). ( البخاري / ٧٤ )**

**ئوبەی كوری كەعب (خوای لیّ رازی بیّت) بۆ عبدالله ی كوری عەباس (خوایان لیّ رازی بیّت) دەگیّریّتەوە كە لە پیّغەمبەری (ﷺ) بیستووە فەرمویەتی:**

**((لەكاتیّدا (حەزرەتی موسا) لەناو كۆمەلّیّك لەبەنی ئیسرائیل دابووە پیاویّك هاتۆتە خزمەتی و پیّی ووتووە: ئایا كەس شك دەبەیت لەخۆت زانا تر بیّت؟ موسا فەرموویەتی:نەخیّر، خوای گەورەش وەحیی كردووە بۆ موسا (عليه السلام) كەبەلّیّ بەندەیەكمان بەناوی خضر (لەتۆ زاناترە). موساش (عليه السلام) داوای لە خوای پەروەردگار كردووە كە بەچ ریّگایەك بگاتە خضر (عليه السلام)؟ خوای گەورەش ماسیی یەكی كردووەتە موعجیزە و نیشانەیەك بۆی. ووتراوە پیّ ی : ئەگەر ئەو ماسیەت لەبەر چاو وون بوو بگەریّوە لەوكاتەدا تۆ دەگەیت بە**

**خضر. موسا (عليه السلام) بەردەوام تەماشای شویّنەواری ماسییەكەی دەكرد لە دەریاكەدا (پاش ماوەیەك) ئەو گەنجەی هاوریّی گەشتەكەی بوو عەرزی كرد:(قوربان) لەو كاتەدا كەلای تاشە بەردەكە لاماندا دەربارەی ماسییەكە. من بیرم چوو هەوالّت بدەمیّ. تەنها شەیتانیش لەبیری**

بردمەوە بۆت باس بکەم (وە ماسی یەکە بەشێوەیەکی سەیر ڕێی دەبڕی لەناو دەریاکەدا).
(موسا) فەرمووی: ئەوەیە کە ئێمە بەدوایدا وێڵین. سەرەنجام بە شوێنی خۆیاندا گەڕانەوە (دەگەڕان بەشوێن خضردا). (ئالەوێدا لای بەیەك گەیشتنی دوو دەریاکە) خضریان بینی و ئەوە لەنێوانیاندا ڕوویدا کە خوای گەورە لەپەڕاوەکەی خۆیدا بەسەرهاتی باس کردوون.

## چیرۆکی چل و پێنج

## بەسەرهاتی پیاوکوژە تۆبەکارەکە

**عَنْ أَبِي سعيدالخدري ( رضى الله عنه ) عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ ( كَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ قَتَلَ تِسْعَةً وَتِسْعِينَ إِنْسَانًا ثُمَّ خَرَجَ يَسْأَلُ، فَأَتَى رَاهِبًا فَسَأَلَهُ، فَقَالَ لَهُ هَلْ مِنْ تَوْبَةٍ قَالَ لاَ. فَقَتَلَهُ، فَجَعَلَ يَسْأَلُ، فَقَالَ لَهُ رَجُلٌ ائْتِ قَرْيَةَ كَذَا وَكَذَا. فَأَدْرَكَهُ الْمَوْتُ فَنَاءَ بِصَدْرِهِ نَحْوَهَا، فَاخْتَصَمَتْ فِيهِ مَلاَئِكَةُ الرَّحْمَةِ وَمَلاَئِكَةُ الْعَذَابِ، فَأَوْحَى اللَّهُ إِلَى هَذِهِ أَنْ تَقَرَّبِي. وَأَوْحَى اللَّهُ إِلَى هَذِهِ أَنْ تَبَاعَدِي. وَقَالَ قِيسُوا مَا بَيْنَهُمَا. فَوُجِدَ إِلَى هَذِهِ أَقْرَبُ بِشِبْرٍ، فَغُفِرَ لَهُ ). ( البخاري / ٣٤٧٠ )**

ئەبو سەعیدی خودری (خوای لێ ڕازی بێت)دەگێڕێتەوە کەپێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی:
((لە ناو بەنی ئیسرائیلدا پیاوێك هەبوو نەوەد و نۆ مرۆڤی کوشتبوو پاشان لەماڵ دەرچوو پرسیاری دەکرد (ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات وە ئایا خوای گەورە تەوبەی ئەو قەبوڵ دەکات) بۆیە چوو بۆ لای ڕاهیبێك ووتی: ئایا بۆی هەیە تەوبە بکات؟ ووتی: نەخێر؟ ئەویشی کوشت. پاشان پرسیاری کرد (کەکێ زاناترین کەسی سەر زەوییە؟ ئەوانیش پیاوێکی زانایان پێ پیشاندا، ئەویش پێ ووت: کەس ناتوانێت ڕێ لەتۆ بگرێت تەوبە بکەیت) بەڵام بچۆ بۆ ئەو دێهاتە (خەڵکێکی تیایە خوا دەپەرستن تۆش لەگەڵ ئەواندا خوا پەرستی بکە، وەمەگەڕێرەوە بۆ ئەو خاکەی خۆت چونکە ئەوە خاکی خراپەیە) ئەویش دەرچوو کە گەیشتە نیوەی ڕێ فریشتەی گیان کێشان هات بۆ لای، ئەویش هەستاو ڕووی کردە ئەو دێهاتەی مەبەستی بوو) پاشان فریشتەی ڕەحمەت و فریشتەی سزا ناکۆکی یان تێ کەوت، فریشتەی ڕەحمەت دەیان ووت: تەوبەی کردووە و ڕووی کردۆتە خوا، فریشتەی سزاش دەیان ووت: ئەو هەرگیز کارێکی چاکی

نەكردووە. پاشان فریشتەیەك لەشێوەی ئادەمیزاد هات و كردیانە دادوەری نێوانیان ووتی: نێوان ئەو دوو شوێنە بپێون لە كامیانەوە نزیك بوو بۆ ئەویانە. خوای گەورەش نیگای كردە لای ئەمیان فەرمووی: نزیك بەرەوە، نیگای كردە لای ئەویشیان فەرمووی: دوور بكەوەرەوە. پیاوەكەش فەرمووی: نێوانیان بپێون تەماشایان كرد بۆ (خاكی خواناسەكان) نزیكترە بە بستێك. سەرەنجام خوا لێ ی خۆش بوو)).

## چیرۆكی چل و شەش

## عومەری كوڕی خەتاب و دراوسێكەی بەنۆرە علیم وەردەگرن

**عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَبَّاسٍ، عَنْ عُمَرَ، قَالَ كُنْتُ أَنَا وَجَارٌ، لِي مِنَ الأَنْصَارِ فِي بَنِي أُمَيَّةَ بْنِ زَيْدٍ، وَهْىَ مِنْ عَوَالِي الْمَدِينَةِ، وَكُنَّا نَتَنَاوَبُ النُّزُولَ عَلَى رَسُولِ اللَّهِ ﷺ يَنْزِلُ يَوْمًا وَأَنْزِلُ يَوْمًا، فَإِذَا نَزَلْتُ جِئْتُهُ بِخَبَرِ ذَلِكَ الْيَوْمِ مِنَ الْوَحْىِ وَغَيْرِهِ، وَإِذَا نَزَلَ فَعَلَ مِثْلَ ذَلِكَ، فَنَزَلَ صَاحِبِي الأَنْصَارِيُّ يَوْمَ نَوْبَتِهِ، فَضَرَبَ بَابِي ضَرْبًا شَدِيدًا. فَقَالَ أَثَمَّ هُوَ فَفَزِعْتُ فَخَرَجْتُ إِلَيْهِ فَقَالَ قَدْ حَدَثَ أَمْرٌ عَظِيمٌ. قَالَ فَدَخَلْتُ عَلَى حَفْصَةَ فَإِذَا هِيَ تَبْكِي فَقُلْتُ طَلَّقَكُنَّ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ قَالَتْ لاَ أَدْرِي. ثُمَّ دَخَلْتُ عَلَى النَّبِيِّ ﷺ فَقُلْتُ وَأَنَا قَائِمٌ أَطَلَّقْتَ نِسَاءَكَ قَالَ ( لاَ ). فَقُلْتُ اللَّهُ أَكْبَرُ. (البخاري / ٨٩ )**

عەبدوڵلای ی كوڕی عەباس (خوایان لێ ڕازی بێت) لە عومەری كوڕی خەتابەوە (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت:

((دراوسێ یەكم هەبوو لە پشتیوانان (الانصار) كە لە هۆزی ((بنی أمیە بن زید)) بوو، ئەو هۆزە لە بەرزایی یەكانی مەدینەدا بوون. من و ئەو بە نۆرە دادەبەزین بۆ خزمەتی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، ئەو ڕۆژێ دادەبەزی و منیش ڕۆژێ جا ئەگەر من دابەزیمایە هەواڵی ئەو ڕۆژەم بۆ دەهێنایەوە لەوەحی و شتی تر، ئەویش دابەزییایە هەمان شتی دەكرد. هاوەڵە پشتیوانەكەم ڕۆژێكیان دابەزی و كە گەڕایەوە زۆر بە توندی دای لەدەرگای ماڵەكەی من ووتی: ئەو لە ماڵەوەیە؟ منیش دڵم داخورپا و چومە دەرەوە بۆ لای ووتی:شتێكی گەورە ڕووی داوە. منیش چووم بۆ لای حەفسەی (كچم) تەماشام كرد دەگری، ووتم:پێغەمبەری خوا (ﷺ) تەلاقی داون؟

ووتی: نازانم. پاشان چوومه خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) هێشتا بەپێوە بووم عەرزم كرد قوربان ژنەكانت تەلاق داوە؟ فەرمووی:نەخێر. ووتم:ألله أكبر.

## چیرۆكی چل و حەوت

## شەوێك له ماڵی پێغەمبەردا (ﷺ)

**عن عبدالله ابْنَ عَبَّاسٍ، اَخْبَرَهُ اَنَّهُ، بَاتَ لَيلَةً عِنْدَ مَيْمُونَةَ زوج النبي ﷺ، وَهْيَ خَالَتُهُ، فَاضْطَجَعْتُ فِي عَرْضِ الوِسَادَةِ، وَاضْطَجَعَ رَسُولُ اللَّه ﷺ وَاَهْلُهُ فِي طُولِهَا، فَنَامَ رَسُولُ اللَّه ﷺ حَتَّى إذَا انْتَصَفَ اللَّيْلُ اَوْ قَرِيبًا مِنْهُ، فَاسْتَيْقَظَ يَمْسَحُ النَّوْمَ عَنْ وَجْهِهِ، ثُمَّ قَرَاَ عَشْرَ ايَاتٍ مِنْ ال عِمْرَانَ، ثُمَّ قَامَ رَسُولُ اللَّه صلى الله عليه وسلم الى شَنٍّ مُعَلَّقَةٍ، فَتَوَضَّاَ فَاَحْسَنَ الوُضُوءَ، ثُمَّ قَامَ يُصَلِّي فَصَنَعْتُ مِثْلَهُ فَقُمْتُ الى جَنْبِهِ، فَوَضَعَ يَدَهُ اليُمْنَى عَلَى رَاْسِي، وَاَخَذَ بِاُذُنِي يَفْتِلُهَا، ثُمَّ صَلَّى رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ رَكْعَتَيْنِ، ثُمَّ اَوْتَرَ، ثُمَّ اضْطَجَعَ حَتَّى جَاءَهُ المُؤَذِّنُ فَقَامَ فَصَلَّى رَكْعَتَيْنِ ثُمَّ، خَرَجَ فَصَلَّى الصُّبْحَ.** (ا لبخاري / ١٨٣)

**عبدالله ی كوڕی عباس (خوای لێ ڕازی بێت) دەگێڕێتەوە:**

**كه شەوێكیان له ماڵی خاتوو مەیموونه ماوەتەوە كه پووری ئەوە و هاوسەری پێغەمبەرە (ﷺ) كاتی نووستن ئەم له لای خوارووی فەرشەوە ڕاكشاوە و پێغەمبەر (ﷺ) و خێزانەكەی له لای سەرووییەوە ڕاكشاون. پێغەمبەری خوا (ﷺ) خەوی لێ كەوت هەتا نیوەی شەو تێ پەڕی یان كەمێ پێشتر یان كەمێ دواتر، پێغەمبەری خوا (ﷺ) بێدار بوەوە و هەستا و دانیشت، دەستی هێنا به دەم و چاویدا و پاشان دە ئایەتی كۆتایی سورەتی (آل عمران) ی خوێند، پاشان هەستا و كوندەیەكی هەڵواسراوی لێ بوو دەستنوێژێكی جوانی لێ گرت و ڕاوەستا بۆ نوێژ كردن. ئیبن عباس دەفەرموێت: منیش هەستام و وەكو ئەوم كرد پاشان چووم له تەنیشتی ئەودا ڕاوەستام، ئەویش دەستی ڕاستی خستە سەر سەرم و گوێ ی ڕاستی گرتم و بای دا. دەستی كرد به نوێژ كردن دوورِكاتی كرد پاشان دوو ڕكاتی كرد پاشان دوو ڕكاتی كرد پاشان دوو ڕكاتی كرد پاشان**

دوو ڕكاتی كرد پاشان یه‌ك ڕكاتی وه‌تری كرد، پاشان ڕاكشایه‌وه‌ تا بانگ بێژ هات به‌ شوێنیدا هه‌ستا و دووڕكاتی كورتی كرد پاشان له‌ماڵ ده‌رچوو نوێژی به‌یانی كرد.

## چیرۆكی چل و هه‌شت

## چیرۆكی خاوه‌ نانی ئه‌شكه‌وت

**عن عَبْدَ اللَّه بْنَ عُمَرَ ( رضى الله عنهما ) ( قَالَ سمعْتُ رَسُولَ اللَّه ﷺ يَقُولُ ( انْطَلَقَ ثَلاَثَةُ رَهْط ممَّنْ كَانَ قَبْلَكُمْ حَتَّى أَوَوُا الْمَبِيتَ إِلَى غَار فَدَخَلُوهُ. فَانْحَدَرَتْ صَخْرَةٌ منَ الْجَبَل فَسَدَّتْ عَلَيْهِمُ الْغَارَ فَقَالُ : وا إِنَّهُ لاَ يُنْجِيكُمْ منْ هَذه الصَّخْرَة إِلاَّ أَنْ تَدْعُوا اللَّهَ بِصَالِحِ أَعْمَالِكُمْ. فَقَالَ رَجُلٌ منْهُمُ اللَّهُمَّ كَانَ لِي أَبَوَانِ شَيْخَانِ كَبِيرَانِ، وَكُنْتُ لاَ أَغْبِقُ قَبْلَهُمَا أَهْلاً وَلاَ مَالاً. فَنَأَى بِي فِي طَلَب شَىْء يَوْمًا، فَلَمْ أُرِحْ عَلَيْهِمَا حَتَّى نَامَا، فَحَلَبْتُ لَهُمَا غَبُوقَهُمَا فَوَجَدْتُهُمَا نَائِمَيْنِ وَكَرِهْتُ أَنْ أَغْبِقَ قَبْلَهُمَا أَهْلاً أَوْ مَالاً، فَلَبِثْتُ وَالْقَدَحُ عَلَى يَدَىَّ أَنْتَظِرُ اسْتِيقَاظَهُمَا حَتَّى بَرَقَ الْفَجْرُ، فَاسْتَيْقَظَا فَشَرِبَا غَبُوقَهُمَا، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَفَرِّجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ منْ هَذه الصَّخْرَة، فَانْفَرَجَتْ شَيْئًا لاَ يَسْتَطِيعُونَ الْخُرُوجَ . قَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ الآخَرُ اللَّهُمَّ كَانَتْ لِي بِنْتُ عَمّ كَانَتْ أَحَبَّ النَّاسِ إِلَىَّ، فَأَرَدْتُهَا عَنْ نَفْسِهَا، فَامْتَنَعَتْ مِنِّي حَتَّى أَلَمَّتْ بِهَا سَنَةٌ منَ السِّنِينَ، فَجَاءَتْنِي فَأَعْطَيْتُهَا عِشْرِينَ وَمِائَةَ دِينَار عَلَى أَنْ تُخَلِّيَ بَيْنِي وَبَيْنَ نَفْسِهَا، فَفَعَلَتْ حَتَّى إِذَا قَدَرْتُ عَلَيْهَا قَالَتْ لاَ أُحِلُّ لَكَ أَنْ تَفُضَّ الْخَاتَمَ إِلاَّ بِحَقِّه. فَتَحَرَّجْتُ منَ الْوُقُوعِ عَلَيْهَا، فَانْصَرَفْتُ عَنْهَا وَهْىَ أَحَبُّ النَّاسِ إِلَىَّ وَتَرَكْتُ الذَّهَبَ الَّذِي أَعْطَيْتُهَا، اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ. فَانْفَرَجَتِ الصَّخْرَةُ، غَيْرَ أَنَّهُمْ لاَ يَسْتَطِيعُونَ الْخُرُوجَ مِنْهَا. قَالَ النَّبِيُّ ﷺ وَقَالَ الثَّالِثُ اللَّهُمَّ إِنِّي اسْتَأْجَرْتُ أُجَرَاءَ فَأَعْطَيْتُهُمْ أَجْرَهُمْ، غَيْرَ رَجُل وَاحِد تَرَكَ الَّذِي لَهُ وَذَهَبَ فَثَمَّرْتُ أَجْرَهُ حَتَّى كَثُرَتْ مِنْهُ الأَمْوَالُ، فَجَاءَنِي بَعْدَ حِين فَقَالَ يَا عَبْدَ اللَّه أَدِّ إِلَىَّ أَجْرِي. فَقُلْتُ لَهُ كُلُّ مَا تَرَى مِنْ أَجْرِكَ مِنَ الإِبِلِ وَالْبَقَرِ وَالْغَنَمِ وَالرَّقِيقِ. فَقَالَ يَا عَبْدَ اللَّه لاَ تَسْتَهْزِئْ بِي. فَقُلْتُ إِنِّي لاَ أَسْتَهْزِئُ بِكَ. فَأَخَذَهُ كُلَّهُ فَاسْتَاقَهُ فَلَمْ يَتْرُكْ مِنْهُ شَيْئًا، اللَّهُمَّ فَإِنْ كُنْتُ فَعَلْتُ ذَلِكَ ابْتِغَاءَ وَجْهِكَ فَافْرُجْ عَنَّا مَا نَحْنُ فِيهِ. فَانْفَرَجَتِ الصَّخْرَةُ فَخَرَجُوا يَمْشُونَ ) .( ا لبخاري / ٢٢٧٢ )**

عەبدوڵڵا ی کوڕی عومەر (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: بیستم لە پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ((لەئوممەتەکانی پێش ئێوە سێ کەس لە ئاوەدانیی دەرچوون،-لەکاتێکدا کە لە ناوچەیەکی شاخاوی دا ڕێ یان دەکرد، دای کردە باران، بارانێکی زۆر بەشێوەیەك ناچار بوون خۆیان بگەیەننە ئەشکەوتێکی ئەو نزیکە-چوونە ناو ئەشکەوتەکە - بەر لەوەی باران تەواو ببێت و بێنە دەرەوە - لە شاخەکەوە بەردێك تلێر بوەوە و هاتە خوارەوە و، دەرگای ئەشکەوتەکەی گرت و - بەهیچ شێوەیەك ماوەی دەرچوونیان نەبوو، ووتیان: هەر کامیان کردەوەی چاکی هەیە و تەنها لەبەر ڕەزامەندی خوایش ئەنجامی داوە، با بیکاتە هۆیەك و لە خوا پێ ی بپاڕێتەوە، بەشکوم ڕەحمیان لەگەڵا بکات. یەکێکیان ڕووی کردە خوای پەروەردگار-و ووتی: خوایە من دایك و باوکێکی زۆر پیرم هەبوو. هەموو ئێوارەیەك ئەبوایە شیرم بهێنایە و پێش هەموو کەس دەرخواردی ئەوانم بدایە، ڕۆژێکیان بەهۆی گەڕانمەوە بە دوای شتێکدا دوا کەوتم و زوو نەگەڕامەوە، کە گەڕامەوە بینیم خەوتوون، منیش قاپە شیرەکەم بە دەستەوە بوو لەسەر سەریان ڕاوەستام، پێم خۆش نەبوو ماڵ و منداڵەکەم لە پێش ئەوانەوە شیرەکە بخۆنەوە و چاوەڕێ بووم بێدار ببنەوە. ئەوەبوو هەستان لە بەرەبەیان دا و شیرەکەیان خوارد. سا خوایە ئەگەر ئەو کارەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە، دەرگای مەرحەمەتت لێمان بکەرەوە و ڕزگارمان بکە. ئەوندەیان زانی بەردەکە کەمێ جوڵا، بەڵام نەیان دەتوانی بێنە دەرەوە. پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی پاشان ئەوی تریان ووتی: پەروەردگار! من کچێکی ئامۆزام هەبوو، لە ڕادەبەدەر خۆشم دەویست، داوام لێکرد خۆی بدات بە دەستەوە و کاری حەرامم لەگەڵ بکات، بەڵام ئەو خۆی نەدا بەدەستەوە، تا ئەوەبوو ساڵێکی گرانیی هاتە پێش و تەنگی بە ئافرەتەکە هەڵچنی و پەنای هێنا بۆ من، منیش سەد و بیست دیناری (زێڕم) دایە بەو مەرجەی خۆی بدات بە دەستەوە، ئەویش ڕازی بوو. هەتا کاتێ ئیشەکەم بۆ دەستە بەر بوو چوومە پێشەوە لێ ی. پێ ی ووتم: (لە خوا بترسە) من بۆ تۆ حەڵاڵ نیم و بە حەڵاڵی نەبێت بۆت نیە پەردەی شەرمم بشکێنی. منیش نەم وێرا دەستی بۆ ببەم و لێ ی دوورکەوتمەوە، لە کاتێکدا لەڕادەبەر خۆشم دەویست. دەستیشم لەزێڕەکە هەڵ گرت کە پێم بەخشیبوو. خوای پەروەردگارم! ئەگەر ئەو کارەم لەبەر ڕەزامەندیی تۆ کردووە، ئەوا دەرگای مەرحەمەتت لێمان بکەرەوە و ڕزگارمان

بكه‌ !. له‌و كاته‌دا به‌رده‌كه‌ كه‌مێكی تر جولا، به‌لام هێشتا نه‌یان ده‌توانی بێنه‌ ده‌ره‌وه‌. پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) فه‌رمووی: پاشان سێیه‌میان ووتی: په‌روه‌ردگار! من چه‌ند كه‌سێكم به‌كرێ گرتبوو، تا كارێكم بۆ ئه‌نجام بده‌ن. هه‌ریه‌كه‌یان كرێ ی خۆیم پێدا جگه‌ له‌ كرێكارێكیان (كه‌ به‌ شانزه‌ ره‌تڵ چه‌ڵتوك به‌كرێم گرتبوو) كرێكه‌ی وه‌رنه‌گرت و رۆی. منیش خستمه‌ نیشه‌وه‌ تا زۆر بوو. پاش ماوه‌یه‌ك هات بۆ لام و ووتی: ئه‌ی به‌نده‌ی خوا! كرێكه‌ی خۆمم بده‌رێ. منیش پێم ووت: سه‌یركه‌.. هه‌رچی تۆ ئه‌ی بینی له‌ ووشتر و مانگا و مه‌ڕ و كۆیله‌، له‌ كرێكه‌ی تۆ په‌یدا بووه‌. ووتی: ئه‌ی به‌نده‌ی خوا گاڵته‌م پێ مه‌كه‌، منیش ووتم: گاڵته‌ت پێ ناكه‌م ئه‌ویش هه‌مووی دایه‌ به‌ر و بردیه‌وه‌ بێ ئه‌وه‌ی هیچی لێ به‌جێ بهێڵێ. سا خوایه‌ ! ئه‌گه‌ر من ئه‌و كاره‌م له‌به‌ر ره‌زامه‌ندیی تۆ كردووه‌، ده‌رگای مه‌رحه‌مه‌تت لێمان بكه‌ره‌وه‌ و رزگارمان بكه‌. دیسان به‌رده‌كه‌ جولا و هاتنه‌ ده‌ره‌وه‌ و چوون به‌رێ ی خۆیانه‌وه‌.

## چیرۆكی چل و نۆ

## چیرۆكی ئه‌وانه‌ی له‌ بێشكه‌دا قسه‌یان كردووه‌.

**عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ، عَنِ النَّبِيِّ ﷺ قَالَ ( لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ إِلاَّ ثَلاَثَةٌ عِيسَى، وَكَانَ فِي بَنِي إِسْرَائِيلَ رَجُلٌ يُقَالُ لَهُ جُرَيْجٌ، كَانَ يُصَلِّي، جَاءَتْهُ أُمُّهُ فَدَعَتْهُ، فَقَالَ أُجِيبُهَا أَوْ أُصَلِّي. فَقَالَتِ اللَّهُمَّ لاَ تُمِتْهُ حَتَّى تُرِيَهُ وُجُوهَ الْمُومِسَاتِ. وَكَانَ جُرَيْجٌ فِي صَوْمَعَتِهِ، فَتَعَرَّضَتْ لَهُ امْرَأَةٌ وَكَلَّمَتْهُ فَأَبَى، فَأَتَتْ رَاعِيًا، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا فَوَلَدَتْ غُلاَمًا، فَقَالَتْ مِنْ جُرَيْجٍ. فَأَتَوْهُ فَكَسَرُوا صَوْمَعَتَهُ، وَأَنْزَلُوهُ وَسَبُّوهُ، فَتَوَضَّأَ وَصَلَّى ثُمَّ أَتَى الْغُلاَمَ فَقَالَ مَنْ أَبُوكَ يَا غُلاَمُ قَالَ الرَّاعِي. قَالُوا نَبْنِي صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ. قَالَ لاَ إِلاَّ مِنْ طِينٍ. وَكَانَتِ امْرَأَةٌ تُرْضِعُ ابْنًا لَهَا مِنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ، فَمَرَّ بِهَا رَجُلٌ رَاكِبٌ ذُو شَارَةٍ، فَقَالَتِ اللَّهُمَّ اجْعَلِ ابْنِي مِثْلَهُ. فَتَرَكَ ثَدْيَهَا، وَأَقْبَلَ عَلَى الرَّاكِبِ فَقَالَ اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلْنِي مِثْلَهُ. ثُمَّ أَقْبَلَ عَلَى ثَدْيِهَا يَمَصُّهُ ـ قَالَ أَبُو هُرَيْرَةَ كَأَنِّي أَنْظُرُ إِلَى النَّبِيِّ ﷺ يَمَصُّ إِصْبَعَهُ ـ ثُمَّ مُرَّ بِأَمَةٍ فَقَالَتِ اللَّهُمَّ لاَ تَجْعَلِ ابْنِي مِثْلَ هَذِهِ. فَتَرَكَ ثَدْيَهَا فَقَالَ اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِثْلَهَا. فَقَالَتْ لِمَ ذَاكَ فَقَالَ الرَّاكِبُ جَبَّارٌ مِنَ الْجَبَابِرَةِ، وَهَذِهِ الأَمَةُ يَقُولُونَ سَرَقْتِ زَنَيْتِ. وَلَمْ تَفْعَلْ ). (ا لبخاري / ٣٤٣٦ )**

ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەگێڕێتەوە فەرموویەتی:

((هیچ منداڵێك لە ناو بێشكەدا قسەی نەكردووە جگە لە سێ منداڵ: عیسا ی كوڕی مەریەم (علیه السلام)، وە هاوەڵەكەی جورەیج لە ناو بەنی ئیسرائیل دا پیاوێك هەبوو بە ناوی جورەیج، ڕۆژێكیان نوێژی دەكرد، لەو كاتەدا دایكی هات

بۆ لای و بانگی كرد،– لە دڵی خۆیدا– ووتی: وەڵامی دایكم بدەمەوە یان بەردەوام بم لە نوێژكردن؟ لەم كاتەدا دایكی ئارامی نەما و دوعای لێ كرد و–ووتی: خوایە نەی مرێنی هەتا دەم و چاوی ئافرەتە بەدڕەوشتەكانی پێ نیشان دەدەیت. جورەیج لە پەرستگاكەیدا بوو– خەریكی خوا پەرستی بوو– ئافرەتێكی بەدڕەوشت ڕێ ی پێ گرت و قسەی لەگەڵدا كرد، بەڵام ئەم ئاوڕی لێ نەدایەوە. سەرەنجام بۆ ئەوەی ناوی بزڕێنێ و لە ناو كۆمەڵگادا سوكایەتی پێ بكات– چوو بۆ لای شوانێك و– خۆی بۆ ڕازاندەوە و فریوی دا و زینای لەگەڵدا كرد و منداڵێكی بوو، وە بە ناو خەڵكیدا بڵاوی كردەوە كە ئەو منداڵە هی جورەیجە. خەڵكیش هاتن پەرستگاكەی جورەیجیان ڕووخاند و پەلكێشیان كرد و بە جوێن دان هێنایانە خوارەوە. پاشان ئەویش دەست نوێژێكی هەڵگرت و نوێژی كرد و هات بۆ لای منداڵەكە و ووتی: ئەی منداڵ باوكت كێ یە؟ ووتی: باوكی من شوانەكەیە (خەڵكیش پەشیمان بوونەوە و) ووتیان: پەرستگاكەت لە ئاڵتون بۆ دروست دەكەینەوە. جورەیج فەرمووی: نەخێر، هەردەبێ لە قوڕ بۆم دروست بكەنەوە. هەروەها ئافرەتێك هەبوو شیری ئەدا بەكوڕەكەی (لەناو بەنی ئیسرائیل) دا، ئەسپ سوارێكی پێكەوتوو چوارشانە بەلایدا تێ پەڕی، ئافرەتەكە ووتی: خوایە كوڕەكەی منیش كە گەورە بوو وەك ئەم پیاوەی لێ دەرچێت. لەو كاتەدا منداڵەكە دەمی لە مەمكی دایكی بەردا و ڕووی كردە ئەسپ سوارەكە و ووتی: خوایە وەكو ئەو پیاوەم لێ نەكەیت. پاشان دەستی كردەوە بە شیر خواردن. ئەبو هورەیرە (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئێستا دەڵێ ی تەماشای پێغەمبەر (ﷺ) دەكەم كە پەنجەی خۆی دەمژی. پاشان بەلای ئافرەتێكی كارەكەر و كۆیلەدا تێ پەڕی و ووتی: خوایە ئەم منداڵەی من وەكو ئەم ئافرەتە نەبێت. منداڵەكەش مەمكی دایكی بەردا و ووتی: خوایە وەكو ئەو ئافرەتەم لێ بكەیت. دایكی ووتی: بۆچی (ڕۆڵە)؟ ووتی: چونكە ئەسپ سوارەكە ستەمكارێكی لووت بەرزە، ئەو ئافرەتە كۆیلەیەش، بوختانی بۆ دەكەن دەڵێن: دزیت كردووە، زینات كردووە، ئەویش وای نەكردووە و بێ تاوانە.

# چیرۆكی پەنجا

## بەسەرهاتی جادووكردن لە پێغەمبەر (ﷺ)

**عَنْ عَائِشَةَ ( رضى الله عنها ) ، قَالَتْ سُحِرَ رسول الله ﷺ حَتَّى انَّهُ لَيُخَيَّلُ الَيْه انَّهُ يَفْعَلُ الشَّيْءَ وَمَا فَعَلَهُ، حَتَّى اذَا كَانَ ذَاتَ يَوْمٍ وَهُوَ عِنْدِي دَعَا اللَّهَ وَدَعَاهُ، ثُمَّ قَالَ اَشَعَرْتِ يَا عَائِشَةُ اَنَّ اللَّهَ قَدْ اَفْتَانِي فِيمَا اسْتَفْتَيْتُهُ فِيهِ . قُلْتُ وَمَا ذَاكَ يَا رَسُولَ اللَّه قَالَ جَاءَنِي رَجُلاَنِ، فَجَلَسَ اَحَدُهُمَا عِنْدَ رَاْسِي وَالاخَرُ عِنْدَ رِجْلَيَّ، ثُمَّ قَالَ اَحَدُهُمَا لِصَاحِبِه مَا وَجَعُ الرَّجُلِ قَالَ مَطْبُوبٌ. قَالَ وَمَنْ طَبَّهُ قَالَ لَبِيدُ بْنُ الاَعْصَمِ، الْيَهُودِيُّ مِنْ بَنِي زُرَيْقٍ. قَالَ فِيمَا ذَا قَالَ فِي مُشْطٍ وَمُشَاطَةٍ، وَجُفِّ طَلْعَةِ ذَكَرٍ. قَالَ فَايْنَ هُوَ قَالَ فِي بِئْرِ ذِي اَرْوَانَ . قَالَ فَذَهَبَ النَّبِيُّ صلى الله عليه وسلم فِي اُنَاسٍ مِنْ اَصْحَابِه الَى الْبِئْرِ، فَنَظَرَ الَيْهَا وَعَلَيْهَا نَخْلٌ، ثُمَّ رَجَعَ الَى عَائِشَةَ فَقَالَ وَاللَّه لَكَانَ مَاءَهَا نُقَاعَةُ الْحِنَّاءِ، وَلَكَاَنَّ نَخْلَهَا رُءُوسُ الشَّيَاطِينِ . قُلْتُ يَا رَسُولَ اللَّه اَفَاَخْرَجْتَهُ قَالَ لاَ، اَمَّا اَنَا فَقَدْ عَافَانِي اللَّهُ وَشَفَانِي، وَخَشِيتُ اَنْ اُثَوِّرَ عَلَى النَّاسِ مِنْهُ شَرًّا . وَاَمَرَ بِهَا فَدُفِنَتْ. ( البخاري /٥٧٦٣ )**

دایكمان عائیشه (خوای لێ ڕازی بێت) دەفەرموێت:

پیاوێك لە بەنی زورەیق سیحری لە پێغەمبەر كرد (ﷺ) پێیان دەووت: (لَبید بن الأعصم) هەتا پێغەمبەر (ﷺ) وا دەهات بە خەیاڵیدا كە شتێكی كردووە، نەیشی كردبوو، هەتا ڕۆژێك یان شەوێك كە لای من بوو، پارایەوە و پاڕایەوە پاشان فەرمووی:((ئەی عائیشە ئایا هەستت كرد خوا ئاگاداری كردم لەو شتەی داوام لێكرد ئاگادارم كات؟ دوو پیاو هاتن بۆ لام یەكێكیان لای سەرم و ئەوی تریان لای قاچم دانیشتن. یەكێكیان بەوی تریانی ووت: ئازاری ئەم پیاوە چییە؟ ووتی: جادووی لێكراوە. ووتی: كێ جادووی لێ كردووە؟ ووتی: لەبیدی كوڕی ئەعصەم، ووتی: لە چ شتێكدا؟ ووتی: لە شانەیەك و چەند تاڵێك موو كە بە دەم شانە كردنی سەر، یان ڕیشەوە دەكەونە ناو قاوغی گوڵی دار خورمایەكی نێرەوە، ووتی: لە كوێ یە؟ ووتی: لەناو بیری ذەروان دایە.

دایكمان عائیشه دەفەرمویّت: پیّغەمبەر (ﷺ) لەگەلّ چەند كەسیّك لـه هاوەلاّنیـدا چـوون بـۆ لای ئەو بیرە. پاشان هاتەوە و فەرمووی:((ئەی عائیشه ئاوی ئـەو بـیرە وەك خەنـەی تیّكرابـیّ وەها بوو، دار خورماكانیشی وەك سەری شەیتانەكان وابـوون)). دایكمـان عائیـشه دەفـەرمویّت: ووتم: ئەی پیّغەمبەری خوا (ﷺ) ئایـا دەرت نەهیّنالـه بیرەكـه؟ فـەرمووی:((نـەخیّر، چـونكه مـن خـوا شیفای دام، پیّشم ناخۆش بوو شەڕ بئالّۆزیّنم بۆ خەلّكی، فەرمانم دا بیرەكەیان پڕكردەوە)).

# ناوەرۆك :

لاپەرە

چیرۆكی یەك ( هاتنی وەحیی بۆ پێغەمبەری خوا ) ٥
چیرۆكی دوو ( ئیسراو میعراج ( شەورەوی و بڵند بوونەوە ) ) ٧
چیرۆكی سێ ( پلە و پایەی شەونوێژ ) ١٠
چیرۆكی چوار ( پلە و پایەی چاكەكردن لەگەڵ كچاندا ) ١١
چیرۆكی پێنج ( پلە و پایەی خێر كردن ) ١١
چیرۆكی شەش ( ڕاسگۆیەك و دوو شەهید ) ١٣
چیرۆكی حەوت ( موصعەبی كوڕی عومەیر شێرە كوڕەكەی مەككە ) ١٣
چیرۆكی هەشت ( بەرەكەتی ئەبوبەكر ( خوای لێ ڕازی بێت ) ) ١٤
چیرۆكی نۆ ( بەرەكتی دوعای پیاوچاكان ) ١٥
چیرۆكی دە ( داد پەروەری لە نێوان نەوەكاندا ) ١٦
چیرۆكی یازدە ( ئەوە سامانێكی بەسود و قازانجە ) ١٧
چیرۆكی دوازدە ( كێ چاكترین كەسە ) ١٨
چیرۆكی سیازدە ( سەلمان ڕاست ئەكات ) ١٩
چیرۆكی چواردە ( لە جێ بەجێ كردنی سزاكانی خوادا تكاكردن نی یە ) ٢٠
چیرۆكی پازدە ( كاسبیی حەلاڵ و لەخوا ترسانی ئەبوبەكر ( خوای لێ ڕازی بێت ) ) ٢١
چیرۆكی شازدە ( بەسەرهاتی بوختانەكە ) ٢٢
چیرۆكی حەڤدە ( چیرۆكی نووشتەكردن بە سوڕەتی فاتیحە ) ٣٠
چیرۆكی هەژدە ( خێر و پلە و پایەی تێكۆشان لە ڕێی خوادا ) ٣١
چیرۆكی نۆزدە ( دانەوەی قەرزی شەهید ) ٣٢
چیرۆكی بیست ( ئەو دەستەی دەبەخشێت چاكترە لەو دەستەی وەردەگرێت ) ٣٤
چیرۆكی بیست و یەك ( سووربون لەسەر وەرگرتنی فەرمودە ) ٣٥
چیرۆكی بیست و دوو ( ئایەتی كورسی و ترسی شەیتان لەو ئایەتە ) ٣٦
چیرۆكی بیست سێ ( جیهاد لە پێناو خوادا لە ناو دەریادا ) ٣٨
چیرۆكی بیست چوار ( پیاوانێك كە ڕاستیان كرد لەو پەیمانەی بە خوایان دابوو ) ٤٠

چیرۆكی بیست و پێنج ( قورئان خوێنه شەهیدەكان ) ٤٣
چیرۆكی بیست و شەش ( پیاوانێك ڕاستیان كرد ) ٤٤
چیرۆكی بیست و حەوت ( ئەوە چاكترە بۆتان له خزمەتكار ) ٤٦
چیرۆكی بیست و هەشت ( كەس تەزكیه ناكەین لەبەر خوا ) ٤٧
چیرۆكی بیست و نۆ ( بەزەیی هاتنەوە بە گیانداران دا ) ٤٨
چیرۆكی سی ( له شته سەرسوڕهێنەرەكانی پەروەردگارمان ) ٤٩
چیرۆكی سی و یەك ( تێگەیشتوویی ئەبوبەكری سدیق ( خوای لێ ڕازی بێت ) ) ٥٠
چیرۆكی سی و دوو ( ئیماندارێك له لێپرسینەوە دەترسێت ) ٥١
چیرۆكی سی و سێ ( خۆ بەكەم زانین له ئاستی هەژاران دا ) ٥٢
چیرۆكی سی و چوار ( بەسەرهاتی بەڵەك و كوێر و كەچەڵەكە ) ٥٣
چیرۆكی سی و پێنج ( بەرەكەتی ماڵ و منداڵی ئەبوبەكر ( ڕەزای خوای لێ بێت ) ) ٥٥
چیرۆكی سی و شەش ( شارە مێروولە ) ٥٧
چیرۆكی سی و حەوت ( خانوو بەرە و گە نجینە ) ٥٧
چیرۆكی سی و هەشت ( ئیماندار پیس نابێت ) ٥٨
چیرۆكی سی و نۆ ( چاكە كردن لەگەڵ ژندا ئەگەر چی له حەیزدا بێت ) ٥٩
چیرۆكی چل ( گایەك و گورگێك قسە دەكەن ) ٥٩
چیرۆكی چل و یەك ( بۆچوونەكانی عومەر ( خوای لێ ڕازی بێت ) موافیقی ویستی خوایە ) ٦٠
چیرۆكی چل و دوو ( بەرائەتی حەزرەتی موسا ( عليه السلام ) له بوختانی بەنی ئیسرائیل ) ٦١
چیرۆكی چل و سێ ( بەسەرهاتی هەزار دینارەكە ) ٦٢
چیرۆكی چل و چوار ( بەسەرهاتی موسا و خضر ( عليه السلام ) ) ٦٤
چیرۆكی چل و پێنج ( بەسەرهاتی پیاو كوژە تۆبەكارەكە ) ٦٥
چیرۆكی چل و شەش ( عومەری كوڕی خەتاب و دراوسێكەی بە نۆرە عیلم وەردەگرن ) ٦٦
چیرۆكی چل و حەوت ( شەوێك لەماڵی پێغەمبەر ( ﷺ ) ) ٦٧
چیرۆكی چل و هەشت ( خاوەنانی ئەشكەوت ) ٦٨
چیرۆكی چل و نۆ ( ئەوانەی له پێشكەدا قسەیان كردووە ) ٧٠
چیرۆكی په نجا ( بەسەرهاتی جادوو كردن له پێغەمبەر ( ﷺ ) ) ٧٢